وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **رۆمان**
- **تابووتێك پڕ لە زیندوو**

- **نووسینی: فەریبا ئیسماعیلی**
- **وەرگێڕانی رەووف مەحموودپوور**
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران رواندزی
- **بەرگ: جێگر عەبدولجەبار**
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١١
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری لاوان (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٧٩)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٤١)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## وتەی وەرگێڕ:

ئەم بەرهەمە چیرۆکێکی درێژە کە باس لە نەهامەتی و ئەشقەسووتاوەکانی ئافرەتی کورد دەکات.

نووسەرەکەی بۆخۆی کچە کوردێکە کە لە باوەشی ئەو کولتوورەدا پەروەردە کراوە و زۆر باش کون و قوژبنەکانی دەناسێت و لەگەڵ هەناسەساردی و ژیانی قەفەساوی ئافرەتاندا بەباشی ئاشنایە.

ئەو، لەم رۆمانەیدا بەکردەوە و لە گۆڕەپانی بەرینی خودی کولتووردا و بە شێوازی کولتووری ئاوقەی نەریتە چەوتەکانی ژیانی دەوروبەری خۆی ئەبێتەوە.

زۆر هوشیارانە، بۆ شوێنی رووداوەکان، دەڤەرێك هەڵدەبژێرێت کە بۆی ئاشنایە. هەربۆیە بۆخۆی ئەچێتە قاوغی کچە پزیشکێکی تارانییەوە کە بە بێ هیچ شارەزاییەك لەگەڵ ناوچەکە، بۆ راپەڕاندنی بەشێك لە ئەزمونکاریی خوێندنەکەی دێتە هەورامان. لەگەڵ سەیرانی پاڵەوانی سەرەکیی داستانەکە ئاشنا دەبێت و دەبنە دوو دۆست و هاوخەم و هاودەمی یەکتر. یەلدا، کە لەتارانەوە هاتووە، لەگەڵ خۆی هوشیاری و رۆشنبیریی هێناوە و هەوڵ دەدات ژنانی ناوچەکە ئاگادار بکاتەوە و لەگەڵ مافەکانی خۆیان ئاشنایان بکات و بۆ پەیڕەوکردنی ژیانێکی ئینسانی هانیان بدات. سەیرانیش دەبێتە نموونەی ئەو ئافرەتانە.

لە رۆمانەکەدا دەبینین کە ژیانی پڕ ستەمی ژنانی گشتگیرە و یەلدا لەگەڵ هەرکامیان ئەکەویتە گفتوگۆ، لەهەمان چارەنووسەوە گلاون. هەرلە شکۆفەی فەقیر و هەژارەوە بگرە تا خاتوو سۆسەنی ژنەخانی هەورامانی و خاتوو شیوای ژنەخانی کرماشانی و...

لەرۆمانەدا زۆر داڵغە و چەوتی و نەهامەتی و حەز و ئاوات و چۆن ژیان و... ئەکەونە بەرچاو و پەردەماڵ دەکرێن. هەر لە هی تاکەکانەوە تا ئەوانەی کۆمەڵگا.

به کورتی ئێمە لەگەڵ رەوتێکی پڕ تراژیدیدا رووبەڕووین،کە بەسەر ژناندا داسەپاوە و ئەوە خودی ژنانیشن کە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو نەهامەتیانەدا دەکەونە خۆ و لەبزاڤ دان.

ئەم رۆمانە، تا ئێستا دووجار بە زمانی فارسی لە چاپ دراوەتەوە و زۆر زوو لە بازاڕدا نەماوە. هەرچەند لەوانەیە لەبواری رۆماننووسی سەردەمیانەدا جێگای باسی زۆر بێت، بەڵام ناواخنی چیرۆکەکە و ئەوەی کە ئافرەتێکی کوردی هەورامانی دانیشتووی گوندی نۆدشە، هاوکات لەگەڵ راییکردنی ئەرکی خێزانداری و منداڵپەروەری، خولقاندوویەتی، شیاوی ئەوەیە کە لەکتێبخانەی کوردیشدا هەبێت و بکەوێتە بەردەستی خوێنەری کوردیش.

هیوادارم ئەم خانمە کوردە، لەداهاتوودا بە زمانی شیرینی کوردیش رۆمانەکانی بخولقێنێت و ببێتە بەشێك لە ئاوەدانی کتێبخانەی کوردی.

رەووف مەحموودپوور ـ مەریوان

پاییزی ۱۳۸۹هیجری. شەمسی

کیژە جوانەکەم یەڵدا، هەستە درەنگە. خۆر کەوتووە. دەتەوێ کەی بۆ سەفەرەکەت ئامادە ببی؟

بە دەنگە زوڵاڵەکەی دایکم لەخەو هەستام. پەردە سپیەکەم لادایەوە.خۆر دەبریسکایەوە و تیریژی دەپژاند. وەك هەمیشە بەهێز و جوانخاس، خۆی دەنواند. دیار بوو کە لەو بەرزاییەوە چاوی لە من بڕیبوو. بزەیەکی جوان نیشتبووە سەر لێوەکانی. لەگەڵ شنەی دەم بەیاندا بۆنی گوڵەکان ماڵەکەی داگرتبوو. کەیفم پێدەکرد. دیتنی دار تووە پیرەکەی نێو حەسارەکە، ئەوەندە بیرەوەریەکانی سەردەمی منداڵیمی زیندوو کردبووەوە کە لە بیرم چوو موسافیرم. نافوورە بچکۆلەکەی نێو حەسارەکە، بردمیەوە بۆ سەردەمی منداڵیم. راستە، خەونەکانی زارۆکیم لە حەساری ئەم خانوەدا هەرگیز فەرامۆش ناکرێن و بەردەوام لەگەڵ زیندوو بوونەوەیان، بۆ ڕابردوو دەمگەڕێننەوە و بەو سەفەرە سەرخۆشم دەکەن.ئەوەیە کە سەفەر بۆ رابردوو لام بەلەزەتە.

بانگەوازی دایکم دووبارە گوێچکەمی لاواندەوە:

ـ خێرابە نازدارەکەم، ئەترسم فریای ئوتومبێلەکە نەکەوی!

پاش ئەوەی ئاوێکم بە دەست و ڕوومەتمدا کێشا، هاتمە سەر سفرەی بەیانی. باوکم نوێژی قەزای دەگێڕایەوە. دایکم خەریك بوو چایی تێدەکرد. نەمئەزانی ئەو دڵەخۆرپەیەی نێو دەروونم لە چییەوەیە! رەنگە هی سەفەرەکەم بێت.

باوکم کە پیاوێکی قسەخۆش بوو، وتی:

ـ کەواتە دەتەوێ بڕۆی؟ بە خوا باش بوو، لەکۆڵمان دەبێتەوە. نانەخۆرێك کەمتر!

دایکم بەو قسەیە تێکچوو:

ـ پیاوەکە تۆ کەی دەتەوێت واز لەو گاڵتەجاڕیە بهێنی؟ ناترسی کچەکەمان بەدڵی بگرێت؟!

ـ ئاخر ئافرەت یانێ تۆ پاش چل ساڵ ژیانی هاوسەری هێشتا خوو و ڕەوشتی من ناناسی؟ نازانی ئەگەر رۆژێك واز لەو قسانەم بهێنم شێت ئەبم؟ خۆ من ناتوانم وەکوو تۆ ناو چاوترشاو و دایم خەریکی بۆڵەبۆڵ بم! ئەی دەبێ یەکێك هەبێ چەند قسەی خۆش بکات تا کچەکەمان بە دڵتەنگی لە ماڵەکە نەڕواتە دەرێ!

دایکم بە دەستە پڕ بەزەییەکانی، قژەکانمی نەوازش دەکرد. چاوە جوانەکانی پڕبوون لە فرمێسك. وەك بڵێی ناتوانێت دووریی من تەحەمول بکات. سەرم لە نێو دەستە جوان و

ناسکەکانی کێشایە دەرەوە. چاوێکم لە پروومەتی وەك مانگی کرد. سەری وەرچەرخاند تا فرمێسکەکانیم لێ بشارێتەوە.

ـ دایکە بۆچی سەرتم لێ وەردەگێڕی؟ لەوانەیە من بۆ جێگایەکی دوور بڕۆم، بەڵام هەرگیز لەخۆبردوویی و خۆشەویستی تۆ لە یاد ناکەم. بەردەوام لە یادم دای. گیانەکەم ئەمە ئەرکێکە کە دەبێ پێی هەستم و بەڕێوەی بەرم. بەڵێن بێت هەرچی زووە پلانەکەم تەواو بکەم و بگەڕێمەوە لاتان.

ماچێکی روومەتم کرد. دەستە نەشمیلەکانیم خستە سەر چاوانم تا بگرە هێوریەك بە ئازاری دووریەکەی بدەن. پاشان چوومە لای باوکم و بە هەموو هەستەکانمەوە خۆم لە باوەشیدا جێگا کردەوە. ئەوجا جانتاکەم هەڵگرت و بە چاوانێکی فرمێسکاویەوە بەرەو گاراج کەوتمە رێ. سەعات نۆی سەرلەبەیانی بوو کە ئوتووبووسەکە بەرەو کرماشان بەڕێ کەوت.لە دڵمدا نیگەرانییەکی بەسام شەپۆلی دەدا. نەم ئەزانی بۆچی هێندە دڵەودوام. ئاخۆ هی ئەوە بێت کە یەکەم جارمە لە بنەماڵەکەم دوور دەکەومەوە. سەعات نزیکەی هەشتی سەرلەئێوارە بوو کە ئوتووبووسەکە گەییشتە گەراجەکەی شاری کرماشان. شەو لەو شارە مامەوە و بۆ بەیانییەکەی دووبارە چوومەوە بۆ گەراج. لە کەسێکم پرسی: ئاغە" چۆن چۆنی دەتوانم بڕۆم بۆ هەورامان؟

ـ خانم، ئەگەر دەتەوێ لە رێگای سنە و مەریوانەوە بڕۆی، باشترە سواری پاسەکانی ئەو شارانە بیت. ئەگەریش ئەتەوێ بە دیتنی زۆر دیمەنی جوان و ئەفسووناوی شاد بیت و لەزەت بەریت، ئەوا دەتوانی لە رێگای پاوەوە بڕۆیتە نۆتشە و لەوێشەوە بڕۆیت بۆ هەورامان.

من کە هیچ شارەزاییەکم لەو شوێنانە نەبوو، لۆژ دامابووم کە دەبێ چی بکەم؟ بەسەر کورسیەکەوە دانیشتم و بۆ ماوەیەك بیرم کردەوە. لە پڕ ئافرەتێك لە تەنیشتمەوە دانیشت. تەمەنی لە پەنجا ساڵ زیاتر دەهاتە بەرچاو. خۆمم لێ نیزیك کردەوە.

ـ سڵاو

ـ سڵاو کچم!

ـ ئێوە باشن؟

ـ ئێی من باشم، ئێوە چۆنن؟

ـ منیش خراب نیم.

بە قسەکانییەوە دیار بوو کە کوردە و زمانی فارسیش باش نازانێ. سەری قسەم لەگەڵ کردەوە.

ـ ببوورە دایکە! ئێوە بۆ کوێ سەفەر ئەکەن؟

ـ مەریوان کچم. ئێوە چی؟

ـ دەمەوێ لە رێگای سنەوە بەرەو هەورامان بڕۆم.

ـ زۆر چاکە کچم. تو دەتوانی لە سنەوە بچیتە مەریوان و لەوێشەوە بڕۆیتە هەورامان.

ـ دایە گیان، لەگەڵ تۆ دەبمە هاوسەفەر. زۆر خوشحالّم. هەر بە ڕاست ناوت؟

ـ گوڵباخ. ئەی ناوی ئێوە؟

ـ یەلدا.

ـ گوڵەکەم، ماشەڵا جوان و ژیکەڵەی. دیارە تازە نەمامی.

ـ هەروایە!

ـ دادەی کچم بڵێ بزانم بۆچی دەچییە هەورامان؟

ـ پزیشکم. دەبێ بۆ ماوەیەك بڕۆمە ئەوێ. بۆ تەواو کردنی خوێندن و بەدەسهێنانی پلەی پزیشکی دەبێ ئەو کارە جێبەجێ بکەم.

ـ کەواتە مەئمووری؟

ـ ئەرێ. وایە.

ـ هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم کچم.

ـ زۆر سوپاس. ببوورە خاتوو گوڵباخ، ئێوە لە کوێی مەریوان نیشتەجێن؟ لەناوشار یان دەوروبەری؟

ـ کانی دینار.

ـ ئەوێ چۆن شوێنێکە؟

ـ گوندێکی گەورەیە. لەسەردەمی شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و ئێراق درووست بووە. ئێستاش ئەوانەی دەسکورتن لەوێ نیشتەجێن.

ـ چەند منداڵت هەیە؟

نۆ منداڵم هەیە!

ـ ماشەڵا زۆریش پیر نیت.

ـ ئەرێ کچم. ئەوە دەستی رۆژگارە وەها تێکی هاڕیوم، ئەگینا ئەوەندەش بەتەمەن نیم.

ـ راستی تەمەنت چەندە؟

ـ چل ساڵ.

ـ وەڵا من دەمگوت رەنگە پەنجا ساڵان بیت!

ـ نا کچم. وتم ئەوە ئازار و مەینەت بەو رۆژەی بردووم. تازە هەڵدەهاتم؟ کەبە شوو درام. ئەگەریش بڵێم هێشتا منالْ بووم، درۆ ناکەم. دوازدە ساڵان بووم. هەرکە چاوم کردەوە لە باخەڵی پیرەپیاوێکدا بووم. باوکم بە زۆر بەشووی دام. لەو پیاوە، کە ئێستا شەست ساڵانە، نۆ منداڵم هەیە. شەش کچ و سێ کوڕ. کچە گەورەکەم شووی کردوە. ئەوانیش هێشتا لای خۆمانن.

ـ دایەگیان، باشە لە گەڵیان دەگونجێ؟

ـ ئەرێ، منداڵەکانم زۆر باشن.

ـ ئەی لەگەڵ مێردەکەت؟

ـ ئەویش خراپ نییە. تازە گەنجێتی خۆمم دۆڕاندوە.لەگەڵ پیریدا راهاتووم. هەرچەند پیریەکی ناوادە!

ئاگرم بۆی تێبەر بوو. ژنێکی گەنج بە روومەتێکی تێك شکاوەوە. ئەتوت لە دایکی من پیرترە.

ـ شوەکەت خەریکی چ ئیش و کارێکە؟

ـ بەتاڵە.پەکی کەوتوە.

ـ ئەی کچە گەورەکەت چەند ساڵانە؟

ـ چواردە ساڵانە.

ـ ئای خوایەگیان. هێشتا کچەکەی چواردە ساڵانە. جل و بەرگەکانیشی کۆن و دڕاون.روومەتی داتەپیوە.

ـ ئەی باشە دایە گیان، چۆن بووە هاتووی بۆ ئەم شارە؟

ـ کچە دە ساڵانەکەم بووە بە ژێر ماشینەوە[١].

ـ وەی خوایە گیان! ئێستا وەزعی چۆنە؟

ـ تەمەنی درێژی بۆ ئێوە جێ هێشت!

١- بووە بەژێر ماشێنەوە: سەیارە لێی داوە.

ـ کەی؟

ـ دە ڕۆژ ئەبێ. چووم بە شوێن پەروەند(فایل)ەکەیدا. وتم بەشکەم ئەو ئوتومبێلەی کە لێی دابوو دۆزرابێتەوە. بەڵام سوودی نەبوو. هەڵاتوە.

ئەوەندە گەرمی قسە بووین کە نەمزانی چوار کاتژمێر چۆن چوو.کاتێکم زانی گەییشتنە کانیدینار. لەوێ لەگەڵ گوڵباخ خانم خواحافیزیمان کرد. خەمەکانی ئەو ئافرەتە دەرفەتیان نەدابووم تا تێر سەیری دیمەنە جوانەکان بکەم. سەعات پێنجی ئێوارە گەییشتمە مەریوان.

هەرچەند زۆر ماندوو بووم، بەڵام بەبێ ماتڵبوون سواری ئۆتومبێل بووم و بەرەو هەورامان کەوتمەڕێ. رۆژئاوابوو کە گەییشتمە ئەوێ.

لە پیاوێکم پرسی:

ـ ببوورن، دەرمانگا(سەیدەلییە) لە کوێیە؟

ـ بە شوێنمدا بێن تا بتان بەم.

لەدووی کەوتم تا گەیشتینە دەرمانگا. هەوا تاریکی کردبوو، باران بە خوڕ دایکردبوو. دیمەنی باران و تاریکایی هەوا، لای من بیرەوەریەکی باشیان هەبوو. حەسارێکی گەورە و باڵەخانەیەکی گەورە و چەند ژووری جوان. لەو پیاوەی کە رێنمایی کردبووم سوپاسم کرد. لە دەرگاکەمدا. پیرەپیاوێك دەرگاکەی کردەوە.

ـ سلاو بابەگیان!

ـ سلاو کچم. فەرموو ژوورێ.سەرمات دەبێ. خێرا بە. ئەم بارانە وابکات، ئەبێ ئەمشەو لە تاو ناڵ و هۆڕی هەورەگرمە، تا بەیانی نەخەوین. راستی کارتان چییە؟!

ـ بابەگیان بڕیارە بۆ ماوەیەك لێرە پزیشك بم.

ـ ئاها... کەواتە دەبنە دوکتوری ئێرە!

ـ بەڵێ. زۆر بەختەوەرم.

ـ منیش هەروا. فەرموون. فەرموون!

بە هەیوانەکەدا رێنمایی کردم و بردمیە ژوورێك کە پیاوێك لەوێ دانیشتبوو.

ـ سلاو ئاغەی ئەمیریان. ئەمە خانم دوکتوری ئێرەیە!

ـ سلاو خانم کەریمی.

ـ سلاو. بەڕێزت؟!

ـ من ئەمیریانم. بەڕێوەبەری ئـەم دەرمانگایــەم. بــە هاتنتــان زۆر خوشـحالّم. فــەرموون دابنیشن.

ـ سوپاس.

ـ تازە گەییشتوون؟

ـ بەلّیّ. چەند خولەکێك دەبێت.

ـ بە تەنیا؟

ـ ئەریّ.

ـ بەخێر بێن.

ـ زۆر سوپاس. لێرە باران زۆر دەباریّ؟

ـ ئەریّ. ئێرە کوێستانە. پاییزیشە و وەرزی بارین دەستی پێکردوە.

ـ شوێنێکی زۆر جوانە. شوێنی وەهام نەدیبوو.

ـ بە هەموو دەرمانگاکەیشەوە پێشکەشتان بێت!!

ـ زۆر سوپاس.

پاش ناسینی بەڕێوەبەری دەرمانگا، بەرەو ژووری خۆم ڕێنمایی کرام. ژوورێکــی گــەورە و جوان لە نهۆمی دووهەمدا. پەنجەرەکــەی ئــەیڕوانی بەســەر بــاخ و باخــات و کوێســتانەکانی ئەوبەردا. زۆر حەزم پێئەکرد.دوو تەختی رەحەت و نــەرم و پــاك وخــاوێن و جوان.سـۆپایەکی نەوتی. چەند دیمەنی جوانی ناوچەکەش بە دیوارەکانییەوە هەلّواسرابوون. جانتاکــەم کــردەوە و جلەکانم دەرهێنا. هەرکە لە سەر تەختەکە دانیشتم، لە دەرگاکە درا.

ـ فەرموون. کە دەرگاکەم کردەوە، ژنێکی بالاّبەرز کە جل و بەرگێکی سپی لەبەردا بــوو، وەستابوو.

ـ سلاّو.

ـ سلاّو. ئێوە کێن!

ـ من مەنیژەی ئابادیم.مامانم. بەرپرسی زاوزێی ژنان. بە هاتنتان زۆر خوشحالّم.

ـ خوشحالّم. منیش یەلدا کەریمیم. فەرموونە ژووریّ.

ـ ئێوە کەی هاتوون؟

ـ کاتژمێرێك ئەبێت. شوێنێکی زۆر جوانە. بەهەشتێکی ون بووە. ئێوە لە کەیەوە لێرەن؟

ـ نزیکەی سالّ و نیوێك ئەبێت لێرم. ئێوە چۆن تەشریفتان هێناوە!

ـــ مـــەعموورم. تـــازە خوێنـــدنم تـــەواو کردوە.پزیشـــکم. بـــۆ تێپەڕانـــدنی مـــاوەی مەعمووری(خزمەت)ەکەم هاتوومەتە ئێرە.

ـ هەست ئەکەم نیگەرانیت؟

ـ نەك زۆر. کەمێك دڵم گیراوە.

ـ ئاساییە. منیش لە سەرەتای هاتنمدا هەروا بـووم. بـەڵام وردەوردە راهـاتم. بەهـەرحاڵ خوشحاڵم کە لە ژوورێك داین.

ـ کەواتە ئێرە ژووری ئێوەیە؟

ـ ژووری هەردووکمانە!

ـ سوپاس بۆ ئەوەی لەگەڵتانم.

ـ تکایە. ئەمە مایەی شانازی منە.

مەنیژە ئافرەتێکی لەسەرخۆ و باڵابەرز بوو. روومەت جەم بوو.جوان و بەخەندە بوو. پـاش ئاشنابوون لەگەڵی، بووینە هاودەم و ئیدی دڵەڕاوکێکانم ڕەوینەوە. بەیانییەکەی بردمیە ژووری کارەکەم و لەوێ دەسبەکار بووم.

پاش چەند رۆژ لە دەسبەکاربوونم، لـە پـڕ نەخۆشـێکی بەپەلـە (ئورژانسـی)یان کـرد بـە دەرمانگاکەدا. ژنێکی جوانخاس کە لە دۆخێکی نالەباردا بوو. دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە. هەرکـە دۆخەکەی تاڕادەیەك ئاسایی بوویەوە، چوومەوە سەری:

ـ سڵاو خانمە جوانەکە! وەزعتان چۆنە؟ شوکور باشترن.

ـ زۆر سوپاس.

ـ بۆچی وەهاتان بەسەر هاتووە؟ کەمتەرخەمیی خۆتان بووە؟

سەرنجێکی دەوروبەری دا و وتی: کام کەمتەرخەمی خانم!

ـ ئەی فەرامۆشت کردوە لە پلیکانەوە داکەوتووی!

وەك نارەزاییەك سەری لێ سووڕاندم.

وتم: ئێوە لە دۆخێکی نالەباردا بوون. دوو ڕۆژە لێرەن. بـەڵام ئـەمڕۆ ئـەتوانن بگەڕێنـەوە ماڵەوە.

گەڕامەوە ژوورەکەم. لە پشت مێزەکەم دانیشتبووم. پاش چەند خولەکێك لە گەڕانەوەم، لە دەرگاکە درا.

: فەرموون.

وەی خوایەگیان چ خانمێکی جوانخاسی! جلەکانت هێندەی دیکە جوانیان کردووی. تۆ هەمیشە وەها جوانی؟ مات ببوو. وەڵامی نەدایەوە.

ـ خانم دوکتور بۆ زەحمەتەکانتان زۆر سوپاست ئەکەم.

خواحافیزی کرد و رۆیشت. پیاوێکی لەگەڵ بوو کە چل ساڵەی دەنواند. کورتەباڵای قژ ماش و برینجی بە چاوانێکی بادامی و ریشێکی درێژەوە.

پێم وت: ببوورن کاکە، ئێوە مێردی ئەم خانمەن؟

ـ ئەرێ خانم دوکتور! چی بەسەر هاتووە؟

ـ شتێکی مەترسیدار نییە. لە پلیکانەوە هەڵدێراوە. زۆر ئاگاداری لێ بکە. باری دەروونیی باش نییە.

ـ بەچاوان.

پاش کەمێك وەستان، راچێتەی دەرمانەکانی لێ وەرگرتم و لە ژوورەکە رۆیشت. لە پەنجەرەکەوە سەیرم ئەکردن. ژنەکە لەبەر پیاوەکەوە ئەڕۆییشت. وەك بڵێی لەیەك تۆرا بن.

شەوەکەی بەردەوام لە بیری ئەو ژنەدا بووم کە بۆچی وەها کپی کرد بوو. لە مەنیژەم پرسی: ئەو ژنەت بینی کە لە پلیکانەوە هەڵدێرابوو؟

ـ ئەرێ بینیم.

ـ دەیناسی؟

ـ ئەرێ، بۆچی دەپرسی؟

ـ گرنگ نییە، هەروا پرسیم.

ـ حەز دەکەی سەبارەت بەو ژنە بۆت باس بکەم؟

ـ ئەرێ، بەخوشحاڵیەوە.

ـ ناوی سەیرانە. ژنێکی ناسراوو جوانە. جوانییەکەی بەسەر زارانەوەیە. بەڕادەیەك جوانە، هەرکە لە ماڵ دەرکەوت، هەموو چاوەکان بە دوایدا وێڵ ئەبن.

ـ ئەزانی بۆچی لە پلیکانەوە داکەوتبوو؟

ـ واز بێنە توخوا. حەوسەڵەت زۆرە؟

ـ حەز ئەکەم بزانم. مێردەکەشی لە خراپ نەدەچوو.

ـ هەروایە. پیاوێکی باش و دەوڵەمەندە.

ـ ناوی چییە؟

ـ ئەتەوێ بڕۆم پێناسەکەی دایەگەورەشی بهێنم!

ـ بەسە مەنیژە. تەنیا چەند پرسیارێکم بە مێشکدا هات.

ـ لانی کەم دان بەوەدا بنێ کە ئاشقی ژنەکە بووگی.

ـ وەی مەنیژە، چۆن بەوەت زانی؟

ـ من وام ئیتر. هەرکەس ئەیبینێ هەروایە. تۆ یەکەم و ئاخر کەس نیت. مەگەر نەمگوت بەسەر زاری هەموانەوەیە.

چەند رۆژێك بیرم لێ دەکردەوە. ئاواتم ئەوە بوو جارێکی دیکە بیبینم. تا ئەوەی کە رۆژێك لە گەل مەنیژە چووبوونییە دەرەوە، لەپڕ تووشی بووین. مەنیژە ماشێنەکەی لێدەخوڕی. هاوارم کرد: بوەستە. بوەستە. ئەها...ئەو ژنە لە سەیران دەچێت! دەیبینی؟. ئەها لە قەراخ جادەکەیە!

منیژە ماشینەکەی راگرت.دابەزیم. بە شوێنیدا چووم. بانگم لێکرد: بوەستە خانم، بوەستە، کارم پێتە.

کاتێك وەستا و لای کردەوە، زانیم کە بە هەڵەدا چووم. داوای لێبوردنم لێکرد و رۆیشتین.

مەنیژە وتی: یەلدا با بگەڕێینەوە، بەنزینمان نەماوە.

ـ باشە. با وابێ.

هەرکە گەیشتینەوە دەرمانگا، ئاغای ئەمیریان هاواری بەرز ببۆوە:

ـ دوکتور ئابادی، ئێوە نابێ بەبێ ئاگاداری من ئێرە چۆڵ بکەن. ئێرە شوێنێکی شاخاویەو هەرکات لەوانەیە رووداوێك بقەومێ.

ـ بە تۆش دەڵێم دوکتور کەریمی، ئەوەندە شوێنی دوکتور ئابادی مەکەوە، نەوکا ئێوەش لە رێگای راست بەدەر بکات.

هەردووکمان لە قاقای پێکەنینمان دا و بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین. لەمەنیژەم پرسی:

ـ مەنیژە تۆ تەمنت چەندە؟

ـ من بیست و هەشتساڵم. ئەی تۆ؟

ـ بیست و پێنج ساڵ. کەواتە تۆ لە من گەورەتری.

ـ بۆ مێردت نەکردوە یەلدا؟

ـ نامەوێ شوو بکەم، هاز و حەوسەڵەی شووداریم نییە. ئەی خۆت چی مەنیژە؟

ـ من دەسگیراندارم.

ـ بەڕاستتە!

ـ ئەریّ، ئاغەی ئەمیریان!

ـ کەواتە گەرەکتە پێم ڕابوێری!

ـ ئەی بلّێم چی؟ کەس نایەوێم! نە جوانم و نە زەڕە شیرین. کەواتە ئەبیّ هەر ئاوا داکەوین تا یەکێك پێمان دەلّیّ کەرت بە چەندی.

ـ واز بێنە مەنیژە!

مەنیژە کچێکی گالّتەچی و خوێن شیرینە. بەشی خۆشی جوانخاسە. خـەلّکی کرماشـانە و نزیکەی سالّ و نیوێکە لە هەورامانە. ڕۆژێك، دەمەو ئێوارە، لە کاتێکـدا کـە هـەوای دەرەوە زۆر سارد بوو، لە پالّ سۆپاکە دانیشتبووم. مەنیژەش لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. وتی:

ـ یەلدا! کام وەرزت لا جوانە؟

ـ من پاییزم خۆش دەویّ. تۆ چی؟

ـ بەهار.

ـ کەواتە ئێستا بمرە و بەهار دووبارە زیندوو ببەوە!

تۆش هەروا زیندوو بە، بکەرە بەر پەنجەرەکە و باسی پاییز و وەرزە دلّخوازەکەت بکە!

ـ تۆ واز بێرە مەنیژە، بلّێی بۆ جارێکی دیکە سەیران ببینمەوە؟

ـ بۆچی ئەو ژنە وەها فکری داگیرکردووی؟باشتر نییە نیـو هێنـدەش لـە بـیری مێردێکـدا بیت؟

ـ مەنیژە گیان، هەرکە ئەمەویّ لەگەلّت باسێك بکەم، بەجۆرێك بەرپەرچم دەدەیتەوە، کە بیّ دەنگم دەکەیت!

ـ هەروایە یەلدا گیان. وا باشتر نییە شوو بە مێردەکەی بکەیت تا هەموو ڕۆژیّ بتوانیـت بیبینیت! ئاغا سەیوان زۆرتر بە تۆ دێت تا بەو ژنە جوانە. تۆ شیاوی ئـەویت نـەك سـەیرانی بەخت مردوو.

پاش چەند ڕۆژ کارکردن لە نەخۆشخانە، بڕیارمان دا لەگەلّ مەنیژەدا سـەرێك لـە بـازاڕی هەورامان بدەین.

ـ مەنیژە هەستە با بڕۆین.

ـ حەوسەلّەم نییە.

ـ هەستە کچیّ، کەم بنوو، دووچاری خەمۆکی ئەبیت.

ـ لەوە باشترە لە گەل تۆ بێمە دەرێ.

پاش ئەوەی خۆمان ئامادە کرد، چووینە دەرەوە. بە کۆلاّن و بازاڕی هەورامانـدا کەوتینـە پیاسە کردن. لەمەنیژەم پرسی:

ـ مەنیژە پێت چۆنە ئەگەر بلّێم با بڕۆین هەوالّێکی سەیران بزانین؟

ـ واز بێنە کچێ؟ چیت لەو ژنە بەدبەختە داوە؟

ـ بەدبەخت؟ کێ ئەلّێ خۆشبەخت نییە! بەو مات کردنەیـدا دیـار بـوو کـە خۆشـبەختە. گاهەس خوو و ڕەوشتی هەروا بێت. بە سەرو و وەزعیا دیار بوو کە خۆشبەختـە.

ـ وادیارە وازم لێ ناهێنی. باشە با بڕۆینە مالّیان و بە بیانووی ئەحوالّپرسی، بیبینین. بەدەم قسەوە گەییشتینە بەردەرگای مالّی سەیران.

ـ بڕوانە مەنیژە! خانوەکە چەندە جوانە! بلّێی ئێرە مالّی ئەوان بێت؟ باشترە بپرسین.

ـ باشە.

ـ سلّاو کوڕی باش!

ـ سلّاو.

ـ ناوت چییە؟

ـ ئەحمەد

ـ ئەحمەدگیان دەزانی ئەم خانوە مالّی کێیە؟

ـ ئێرە مالّی خانە.

ـ ئەی ئەزانی مالّی سەیران کامەیە؟

ـ ئەمە مالّی سەیران خانمیشە.

ـ چیت وت؟ مالّی سەیرانیشە؟! کەواتە ئەیناسی؟

ـ ئەرێ. ژنی سەیوانە. کوڕەکەی خان.

ـ وەرە مەنیژە! ئێرە مالّی سەیرانە. نەمگوت ئەو هەمـوو جوانخاسیە هاوار لە خۆشـبەخت بوونی دەکات؟ ئەگەر ئێمەش هێندە دەولّەمەند بووینایە، خۆشبەختیش دەبووین. جوانخاسیش دەبووین. وەرە، وەرە با لە دەرگاکە بدەین.

هەرکە لە دەرگاکەمان دا، کچێکی گەنم ڕەنگی جوانخاس دەرگاکەی کردوە.

ـ ئازیزم، سەیران لە مالّە؟

ـ ئەرێ. فەرموون.

ـ خودایەگیان، ئەمە کچی ئەوە؟ کوتومت دەڵێی سەیرانە، مەنیژە!

ـ بوەستە یەلدا، ئەبێ بپرسین.

پاش ئەوەی کەمێك ماتڵ بووین، سەیران، بەلارو لەنجەوە بە پلیکانەکاندا هاتــە خــوارێ. چەندە جوان بوو. کراسێکی ماتی لەبەردا بوو. سەرپۆشێکی والای بەسەرەوە بوو. چاوە رەش و گەورەکانی دڵیان دەڕفاند. کەڵەگەت و جوان بوو. من غەرقی تەماشاکردنی ببووم. مەنیژە لە حاڵێکدا کە هەوڵ ببوو وتی:

ـ سلاو سەیران خانم! چۆنی؟

ـ سلاو دوکتور ئابادی! فەرموون.

ـ ئێوە چۆنن دوکتور کەریمی؟

ـ سلاو سەیران خانم! حاڵتان چۆنە؟ بێرەدا گوزەرمان ئەکرد وتمان سەرێکت لێبدەین و ئەحواڵێکت بپرسین.

مەنیژە قسەکەی پێ بڕیم وتی:

نا سەیران خانم وا نییە کە دوکتور کەریمی باسی ئەکات. ئەو ئاشقی دیتنی دووبارەی ئێوەیە و هەر بەو بۆنەشەوە هاتووین.

مەنیژە فێڵبازانە وەهای وت. بێدەنگ بووم و هیچم نەوت. سەیران زەردەخەنەیەکی کرد و خولکی کردینە ژوورەوە.ماڵێکی دوونهۆمی جوان بوو. بە نمایەکی ئاجۆریەوە. بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین. ماڵێکی جوان بە هەمەجۆر پێداویستیەوە.

ـ فەرموون دانیشن. زۆربەخێر بێن. شادیتان هێنابێت. گەورەتان کردین.

ـ ئەو رۆژە زۆر نیگەرانت بووم. ویستم ئەحواڵت بپرسم.

ـ بەڕاستی بە دیتنی تۆ و مەنیژە زۆر شاد بووم خانم دوکتور گیان!

جوانیی رووومەتی سەیران، بەرەوخۆی راکێشام. بەردەوام سەیرم ئەکرد و چاوم لێ هەڵنەئەگرت. کاتێك چایی تێدەکرد، جوانیی دەست و پەنجەی لە وەسف نەدەهات. چاوە خومار و خەمناکەکانی ، دەتگوت دنیایەك نهێنی یان لە خۆدا حەشارداوە. کەسێکی دەویست ئەو رازانە بخوێنێتەوە. لێم پرسی:

ـ سەیران گیان چەند منداڵت هەیە؟

: دوان.

تۆ زۆر گەنجی. کەچی منداڵەکانت گەورەن. چۆن وەها جوان ماویتەوە؟

سەیران خۆی لێ کەڕ کردم.

ـ بەڕاست یەلدا خانم، تۆ شووت کردووە؟

ـ نەگیانەکەم، مێردم نەکردوە.

ـ بۆچی؟

ـ نازانم.رەنگە بەختم هەڵنەهاتبێ.

ـ مێردەکەت کاری چییە سەیران خانم؟

ـ شوەکەم قالّی فرۆشە.

جاروبار سەیران بە خۆیدا رۆ دەچوو و چاوی دەبڕیە شوێنێك. حەزم ئەکرد زیاتری لێ بپرسم، بەلاّم لەم دۆخەدا بێدەنگیم بە باشتر زانی. پاش ماوەیەك بڕیارم دا بڕۆم. هەرچەند سەیران پێداگربوو نەڕۆین، بەلاّم من بە باشم زانی بڕۆینەوە.هەرچەند دژوار بوو دلّی لێ بەردەین، بەلاّم ناچار بووین لێی جیا ببینەوە.

شەو، کاتی نووستن، لەگەڵ مەنیژەدا سەبارەت بە چوونمان بۆ مالّی سەیران کەوتینە دەمەتەقێ.

ـ مەنیژە، بەڕاست تا ئێستا ئافرەتێکت دیتوە؟

ـ شتی وام قەت نەدیوە. تۆ چی؟

ـ منیش نەم دیوە. ئەزانی مەنیژە، هەستم کرد سەیران شتێك ئازاری ئەدات.

ـ نا... وانییە، ئەو زۆر خۆشبەختە. مالّەکەیت دی چەندە رازاوە و بە سامان بوو. خانوویەکی زۆر جوان بە هەموو پێداویستیەکەوە.

ـ گوێ رادێرە مەنیژە، بە باوەڕی تۆ خۆشبەختی تەنیا لە پارە و جل و بەرگ و کۆشکدایە. ئەمانە هەرگیز خۆشبەختی ناهێنن. دەبێ دلّ خۆش بێت. ئەبێ مرۆڤ بۆخۆی هەست بە حەسانەوە و کامەرانیی بکات.

روانینی لەسەرخۆی مەنیژە درکاندی، کە لەگەلّ بۆچوونەکەم دایە. لە وەلاّمدا وتی: سەیران، جوان و لەسەرخۆ و بێدەنگە. بێدەنگیەکەی پڕ نرخ و سەفایە. یەلدا" تۆش هەستت بەمە کردوە؟

لە وەلاّمیدا سەرم بە نیشانەی ئەرێ وتن راوەشاند. ئەمە تەنیا هەلّسوکەوتێك بوو کە بە گونجاوم زانی لە بەرانبەر ئەو پرسیارەدا لەخۆمی نیشان بدەم.

ئەو شەوە تا درەنگانێك بیرم لە سەیران دەکردەوە. بەردەوام لە خەیاڵیدا بووم و لەخۆمم ئەپرسی کە چۆن چۆنی ئەتوانم یاریدەی ئەو ئافرەتە بدەم.نەمدەزانی بۆچی دەبێ بکەومە سەر ئەم رایە. بگرە بۆ ئەوە بێت کە حەز دەکەم چێژ لە دیتنی وەرگرم. هەموو رۆژی دەچوومە سەرکارەکەم و وەك هەمیشە دوانیوەڕوانیش لە حەوشەکەدا پیاسەم دەکرد. دوانیوەڕۆی رۆژێکی دووشەممە بوو کە پاڵم دابوو بە دارگوێزە پیرەکەی نێو حەوشەکەوە، کە مەنیژە بەرەو لام هات و گوتی:

ـ یەلدا دەزانی کێ بانگت دەکات؟

ـ کێیە؟

ـچووزانم، کێ ئەڵێ سەیران نەبێت؟

به بیستنی ئەم وتەیە گەشامەوە و بەرەو دەرگای حەوشەکە چووم. هەرچی سەیرم کرد، کەسم نەبینی.کەلایەکیترم کردەوە،بینیم سەیران لە بن دیوارەکەدا راوەستاوە. بەرەو لام هات و بە دیتنم زەردەخەنەیەکی نیشتە سەرلێوەکانی.

ـ سڵاو خانم دوکتور! حاڵتان باشە؟

ـ سڵام ئازیزم! تۆ چۆنی؟ بە دیتنت زۆر خۆشحاڵم. ئاواتی من ئەوە بوو کە بتوانم بتبینمەوە. بگرە بتوانم بە دیتنت هەست بە ئاسوودەیی بکەم. بەڕاستی هۆگرییەکی زۆرم پێت پەیدا کردووە!

ـ منیش هۆگرت بوومە خاتوون. وا هەست ئەکەم هەڤاڵێکی باشم دۆزیوەتەوە، خۆزگە ئەخوازم کە پێشتر بمتوانیبا ئێوەم بناسیبا.

ـ باشە سەیران گیان خوا رەحمی کردوە ئەمڕۆ سەردانت کردووم! وەرە ژووری،دەی لەبەر دەرگا مەوەستە.

ـ حەوشەکەتان چەندە جوانە!

ـ کاتێ بۆ یەکەمجار هاتمە ئێرە، هەستێکی باشم نەبوو، بەڵام وردەوردە هەستەکەم گۆڕا. ئەمڕۆش بە دیتنی تۆ، بیرەوەرییەکی شیرن و نەمرم هاتۆتەوە بیر.

شانبەشانی یەکتر تا ژوورەکەم رۆشتین.من کەوتمە پێشێ تا رێنوێنی بکەم. سەیرانیش بە دوامدا هات.

ـ ئەمە ژووری من و مەنیژەیە. فەرموون فەرموون.

ـ چە ژوورێکی رازاوەیە!

سـەیران هاتـە ژووریٚ لەسـەر فەرشـەکە دانیشـیت. داوام لیٚکـرد تـا لەسـەر تەختەکـە دابنیشیٚت، بەلاّم ئەو وای پیٚخۆش بوو لەسەر قالیٚەکە دابنیشیٚت. میوانداریم کـرد و ئـەوجا، داوام لیٚکرد تا باسی خۆیم بۆ بکات. سەیران دەستە جوانەکانی دابووە بەر ئـەژنۆی و بەشـیٚك لە قژە رەشەکانی لە ژیٚر هەورییە سوورەکەی سەریەوە دەرکەوتبوون. بەردەوام چاوی لە گـولّی مافوورەکە بڕیبوو.

ـ سەیران! لە ژیانت رازیت؟

ـ پیٚویست ناکات وەلاّمت بدەمەوە.

ـ نازانم، بگرە پیٚویست نەبیٚت. بەلاّم هەست دەکەم بتوانم یاریدەت بـدەم. ئەمـەش لەبـەر ئەوەیە کە زۆر خۆشم دەویٚی. خوشحالّ دەبم ئەگەر تۆش من بە دۆستی خۆت بزانی.

ـ من شتیٚکم بۆ وتن نییە.

ـ باوڕ ناکەم. زۆر شتت هەیە کە لەمنی ئەشاریتەوە. هەستیٚکی دەروونی پیٚم ئـەلیٚت کـە تۆ زۆر دلّتەنگی و پیٚوستت بە یاریدەی من هەیە.

ـ نامەویٚ بە گیٚڕانەوەی نهیٚنییەکانی ژیانم، زویر و نیگەرانت بکەم.

پیٚداگریم کرد تا لانیکەم من بە دۆست و هەڤالّی خۆی بزانیٚت و باوەڕم پیٚ بکات.

ـ پیٚوست ناکات سەرت بیٚنمە ژان. ئیٚستا هاتووم تـا بـە یەکـەوە. نـەهاتووم تـا کۆلّیٚـك بیرەوەریی تالّ و شیرینت بۆ بگیٚڕمەوە. ئەزانی چییە یەلدا خانم! زۆرم پیٚ خۆشە لەگـەلّ تـۆ و بیرەکانتدا ئاشنا ببم.

منیش هەروا سەیران خانم. راستی چەند سالّە شووت کردوە؟

ـ دوازدە سالّە بە شوویان داوم. خوزگە ئەو رۆژە، بۆ گۆڕستانیان ئەبردم. چونکە لەویٚ بـۆ هەمیشە دەحەسامەوە و ئەوەندە چەرمەسەرەم نەدەکیٚشا.

ــ لـەکام چەرمەسـەرە ئـەدویٚی سـەیران؟ ئـەو رۆژەی کەهاتبوومـە مالّتـان، ئـەوە بـیٚ دەنگییەکەت بوو کە منی ترساند نەك ژیانت. بـاوەڕی مـن ئەوەیـە کەخۆشـبەختی بـە چـاو نابینریٚ، لە ناخی مرۆڤ دایە. بەلاّم من لە مالّ و مەنزلّەکەتدا ئەمبینی. بەلاّم هەستم کرد لە بیٚدەنگییەکی سامناك دای. ئەگەر بە شیاوم دەزانی پیٚمخۆشە رازی ئەو کپ کردنەت بزانم.

چاوەکانی لە فرمیٚسکدا گەوزابوون. بەلاّم ئیجازەی نەدەدا دلّـی بـەتالّ بکاتـەوە. بینـینی وەها دیمەنیٚك لە سەیران بۆم گران بوو. راستی ئەمە هەمان سەیرانی لووت بـەرز و خـۆڕاگر و جوانخاسی ئەو رۆژەیە کە بە بەر چاوانی منەوە فرمیٚسك دەڕیٚژیٚت؟!

ئەو رۆژەی سەیرانم بینی هەستم کرد سەراپێی غروورە و لەخۆڕازی بوون.بەڵام ئەمڕو نـەك هەر غرووریك بە نێوچاوانییەوە نابینم، بەڵكوو بوغزێك بینەقاقـەی گوشـیوە. هێـدی هێـدی فرمێسکەکانی وەك مرواری بە روومەت و گۆناکانییەوە دەگلانە خوارێ. دەسـتەکانی لەیـەك هەڵپێکابوو و هێندەی جار پەنجەکانی لە قژەکانی دەگێراند و رایدەکێشان. هەموو گیانم گـوێ گرتن بوو. ئاخرەکەی دەمی کردەوە و کەوتە گێڕانەوە:

ـ یەلدای ئازیز، باوکم پیاوێکی هەژارە. هێشتاکەش لە ژیان دایە. هەموو بەدبەختیم لـە ژێر سەری باوکمدا بوو. قەد لە ژیانمدا رۆژێکی خۆشم نەدیوە. ئێستا گوێ رادێرە تا حیکایەتی ژیانی پڕ لە چەرمەسەرەمت بۆ باس بکەم. دایکم ژنێکی زۆر جوان بوو. جوانییەکەی بەرباسی هەموو خەڵکی هەورامان بوو.دایکم کۆچەرێك بوو لە شاری هەولێری کوردسـتانی باشـوورەوە هاتبوو. ئەو لەگەڵ خاڵۆمدا هاتبوونە شاری مەریوان و لەوێشەوە هاتبوونە هەورامان. دایکـم بێکەس بوو. هەر منداڵ بوو دایك و باوکی لە منداڵیدا مردبوون و لای خاڵۆ ئەکبـەرم گـەورە ببوو. خاڵۆم لەبەر گرفتاری و بۆ دابین کردنی بژێوی، رووی لە مەریوان و هەورامان کردبـوو و ئەویشی لەگەڵ خۆی هێنابووە ئـەو غەریبیـە.خاڵۆم فرۆشـیارێکی گـەڕۆك بـوو. لـەو دیـوی سنوورەوە پارچەی هەرزانی ئەهێنایە مەریوان و دەوروبـەری. دایکـم تەمـەنی نەگەیشـتبووە چواردە ساڵ کـە خـاڵۆم لەگـەڵ خـۆی بـۆ هـەورامانی هێنـاوە. ئەڵبـەت بـۆ ماوەیـەك، تـا پارچە(قوماش)کانیان بفرۆشن. بـەڵام باسـی جـوانی دایکـم ئەگاتـە لای حەمەئـەمین خـانی خەزوورم و ئەویش ئەو رۆژە ئیجازەی گەڕانەوە بە خاڵۆم و دایکم نادات و ئەوان بۆ ماڵی خۆی داوەت دەکات. بەمجۆرە خاڵۆم و خانی گەورەی هەورامان یەکتر دەناسن. خاڵۆ و دایکم بۆ چەند رۆژێك لە مـاڵی خـان دەمێننـەوە.جوانی دایکـم بەڕادەیـەك بـووە کـە بـە هـەر کۆڵانێکـدا تێپەڕیبایە، هەموو چاوەکانی بەدوای خۆیدا راکێشاوە. بگرە ئێستا کە تۆ من بە جوان وەسف دەکەی زێدەڕۆیی دەکەیت، چونکە من هەرگیز وەك دایکم جوان نیم.

بەهەرحاڵ، دایکم دەکەوێتـە بەرسـەرنجی خـان. خـان تـا چـاو دەکاتـەوە ئاشـقی دایکـم دەبێت.هەرچی هەوڵ دەدات تا باوك و دایکی رازی بکات ئەوی بۆ بخوازن، رازی نابن. چونکە دایکمیان بە کچێکی گەڕۆکی بێ دایك و باوك زانیوە و هەستیان کردوە هاوشانی ئەوان نییە. بەڵام خان لە دایکم خوازبێنی دەکات. دایکم کە تەمەنێکی ئەوتۆی نابێ، ئەو باسە بە خـاڵۆم دەڵێت. خاڵۆشم بۆ ئەو بڕیارە دایکم دەکاتە سەرپشك. دایکـم هـیچ هـۆگرییێکی بـە خانـەوە نابێت. خان کە دەزانێت دایکم سەرنجی پێنادات، دەکەوێتە ئازاردانی. خـاڵۆم لەگـەڵ دایکـم

ماڵی خان بە جێ دێڵن و دەرۆنە ماڵی باوکم(فەرەج) کە پیاوێکی سەڵتی باخدار ئەبێت.لەوێ بۆ ماوەیەك دەمێننەوە. باوکم ئاشقی دایکم دەبێت بەڵام لە ترسی خان نایدرکێنێ.ماوەیەك تێدەپەڕێت. خان بۆ سووك کردنی دایکم پیلانێك دادەڕێژێت و وای بڵاو دەکاتەوە کە گوایە باوکم و دایکم کاری ناشەرعییان کردووە. هەربەو بیانوەوە فەرمان دەدات تا بە بەرچاوی خەڵکەوە دایکم بدەنە بەر قامچی. ئەمەش بە پێی نەریت، دەبێتە هۆی ئابڕوو چوونی دایکم. پاشان خان فەرمانی دەرکردنی دایکم و خاڵۆم لە هەورامان دەدات.لەم کاتەدا باوکم خوازبێنی دایکم دەکات.دایکی کلۆڵیشم بەناچاری پێی رازی ئەبێت. خاڵۆی دڵشکاویشم پاش ئەو بەسەرهاتە تاڵانە، بەرەو ئەودیو دەگەڕێتەوە و دایکی بێچارەشم کە تەنیا چواردە ساڵان دەبێت، لە ماڵی باوکم بە تەنیا دەمێنێتەوە. دایکم، پاش ماوەیەك دەکەوێتە بەر ئازاری خەڵك و شوەکەی. هەر رۆژ لە لایەن باوکمەوە لێی دەدرێت و لەوپەڕی بێکەسی و غەریبیدا زەجرێکی زۆر دەچێژێ. پاش چەند ساڵ، دووگیان دەبێت و منی دەبێ. بەڵام پاش ماوەیەك دەکەوێتە جێگا و لەبەر توندی نەخۆشیەکەی، بە دڵێکی پڕە لە خەم و پەژارەوە کۆچی دوایی دەکات و من بە تەنیا جێ دێڵێ و لێرە بەدواوە بەدبەختی من دەست پێدەکات. هێشتا پێنج ساڵان بووم کە باوکم ژنێکی دیکەی هێنا.تا چاوم هەڵهێنا خۆم لە بن دەستی باوەژندا بینییەوە. شکۆفە، ناوی باوەژنەکەم بوو کە سەرەتا خۆی وەك دایکم پیشان ئەدا.ماوەیەك تێپەڕی. دنیام لێکرایە دۆزەخ. سەردەمی منداڵیم بە ئازار و مەینەتەوە دەستی پێکرد. بەڕادەیەك لە لایەن شکۆفەوە ئازار دەدرام کە چەند جار بڕیارم دا خۆم بکوژم. لە بیرمە کەهێشتا شەش ساڵان بووم کە هەر رۆژ بە ناهەق ئازاری دەدام. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە زۆر جوان بووم.شکۆفە، ژنێکی رەشتاڵی سووتاو بوو، بەڵام بەو حاڵەشەوە سیحری باوکمی کردبوو.

باوکم کەسێکی دەستەوستان بوو. شکۆفە دەرفەتی ئەوەی پێنەدەدا تا منی خۆش بوێت یان سەرنجم پێ بدات. زۆر بە دژواری سەردەمی منداڵیم تەواو کرد و پێم نایە قۆناغی مێرمنداڵی. لەو رۆژگارەدا هەواڵێك لە خوێندن و قوتابخانە نەبوو، ئەگەریش هەبوایە، ئەوا تایبەت بە بنەماڵە و کەس و کاری خانەکان بوو. وردە وردە پێم نایە تەمەنی دوازدە ساڵانی. منی بێ دایك و تەنیا، بە دایم لە ماڵەوە بووم. شکۆفەی باوەژنم، کەس و کاری زۆر بوو، ئەوان بە دایم و بە زۆری دەهاتنە ماڵی ئێمە و منیش بە ناچاری خزمەتم دەکردن.

رۆژێك باوكم هاتەوە ماڵ و بەسرتە شتێكی بە شـكۆڤە گـوت. مـنی سـاویلكە، هەرچـی هەولّم دا شتێك تیّ بگەم، سوودی نەبوو. پاش چەند خولەكێك، شكۆفە هاواری كرد:سـەیرانی بیّخاوەن، هەستە چایی دەم بكە. خان و كوڕەكەی دەبنە میوانمان.

سەرم سوورِ ما، بەلاّم نەمدەوێرا هیچ پرسیارێك بكەم.

زۆری نەبرد خان و كوڕەكەی هاتنە ماڵمان. باوكم لە ترسان تای لێهاتبوو. خان بە باوكمی وت: گویّ بگرە فەرەج وللاّ، بۆ ئەوە هاتووم پێت بلێم یان دەبیّ هەموو قـەرزەكانت بدەیتـەوە یان لە بری قەرزەكان،ماڵ و باخەكەت بدەیتە ئێمە. ئەگینا زیندان چاوەڕێت دەكات.كوڕەكەی خانیش جار و بار دزەنیگایەكی دەگرتە من. لە حالێكدا كـە ئـەو لـە بیسـت و پێـنج سـالە ئەچوو. منیش تەنیا دوازدە سالاّن بووم. ریش و سمێلّی هاتبوون. لە ترسان نەمدەتوانی چایەكە تیّ بكەم. ئەوە بوو كە قۆریەكە بە دەسـتمەوە داكـەوت. شـكۆفەش بـە بەرچـاوی ئەوانـەوە شەقەزیلەیەكی توندی پێدا كێشام و گرتمیە بەر تانە و تەشـەر و لێـدان. زۆری نـەبرد، خـان و كوڕەكەی هەستان چوون و من مامەوە و شكۆفە و باوكە بیّ غیرەتەكەم. باوەژنم، بەبەرچـاوی باوكمەوە ئەوەندەی لێدام كە هەموو گیانەم شین هەلّگەڕا. بیّ باوكم ئەوەندە بیّ غـیرەت بـوو كە تەنانەت نەهات دەستیشی بگرێت. هەرگیز ئـەو رۆژەم لـە یـاد ناچـێتەوە. چـەند رۆژێـك كەوتمە جێگاوە. رۆژێك، دوانیوەڕۆ بوو كە باوكم گەڕایەوە ماڵ و لە پالّمدا دانیشت.

ـ كیژە خۆشەویستەكەم سەیران، گویّ رادێرە. بەختت كراوەتەوە. كوڕی خان ئاشقت بووە. باوكی بەلای منەوە خوازبێنی كردوی. تۆ ئەتوانی ببیتە بووكی مالّەئاغا!

لە كانگای دلّمەوە بیزم لە باوكم هاتەوە كە بۆچی تۆزقالێك بەزەیی لە دلّدا نییە. بەلاّم لە ترسان كپم كرد.

شكۆفە بە باوكمی گوت: ئەوە پرسی چی دەكەی پیاوەكە! ئەم كچـە گێلەكـە گـو دەخـوا دەلیّ نا. پێیان بلیّ هەر ئەمشەو بێن كارەكە راپەڕێنن.

من وەك بووكەلّەیەك بووم بە دەستەكانی باوەژنمەوە.بۆخۆم خاوەن هیچ بڕیارێك نەبووم.

سەعات نۆی شەو، خان و خاتوو«سۆسەن» و كوڕەكـەیان، هاتنـە مالّمـان. شـكۆفە وەك دەستە گولّ منی رازاندبۆوە تا بە مشتەریەكانم بفرۆشێت.

ئەو شەوە،بنەمالّەی خان غەرقی سەیركردنی من بوون. قەد ئەو شەوە فـەرامۆش ناكـەم. من لەو باسانە شتێك حالّی نەئەبووم. هیچ ئـەزموونێكم نـەبوو. هاوتەمەنـەكانم هێشـتا بـە

بووکەڵەکانیان گەمەیان ئەکرد کە من بوومە بووکەڵەی دەستی باوکم و خان. چەندەم لا گـران بوو.

کوڕەکەی خان بەردەوام دزەنیگای لێ ئەگرتم و کەیفی ئەکرد. بـەڵام مـن لـە دڵـەوە، لـە ناوچاوان و روومەتی ئەو نفرینم دەکرد. لەپڕ خان رووی لە من کرد و پرسی: پێت خۆشە ببیتە ژنی کوڕەکەم؟

خێرا خاتوون وەقسەهات: ئەبێ لە خوداش بپاڕێنەوە کە پێمان ناوەتە ماڵیان!!

شکۆفەش وتی: قوربان، ئەبێتە کەنیزتان. بەڵام هەرجۆر پێتان ئەکرێ، ئەتوانن دەستەمۆی بکەن، چونکە  زۆر سەرکەشە.

لەبەر خۆمەوە وتم: ئاخرەکەی شەوێك ئەتتاسێنم هەی عفریتە! بەڵام لە ترسان خەریك بوو زراوم بچێ. بۆیە ئەو شەوە هیچم نەوت. باوکم منی بەوان فرۆشت تا خـان ریسـوای نـەکات. هەرچۆنێك بوو زەماوەندە پڕ لە نەگبەتییەکەمان رێ خرا. سەیوان لە خۆشیان، لە پێستی خۆی نەئەگونجا کە توانی بووی وەها گوڵێك دەس بخات.

پاش چەند رۆژ ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ، گوێستیانەوە. بەڵام ئاخ چە بەختێك! چە بووکێك!

پاش رۆیشتنی میوانەکان، لە حاڵێکدا کە بە قەولی «سروەخانم» لە جـل و بـەرگی سـپی بووکێنیدا وەك خۆر ئەدرەوشامەوە، بردمیانە ژووری پەردە.

(راستی سروەخانم، ژنێکی گەڕاوە بوو کە لە ماڵی خاندا کلفـەتی دەکرد.ئـەو، مـنی وەك کچی خۆی خۆش ئەویست.پاش مردنی دایکم، تەنیا کەسێك بوو کە نازی پێدەدام. لای ئـەو، من فریشتەیەکی جوان بووم کە بە دیتنم لەزەتی دەبرد.)

هەروەك منداڵێك، نەمدەزانی چی روودەدات. لام وابوو رەنگە بوو بەرخزمەتکاریم ببـەن. بەڵام چاوت رۆژی خراپ نەبینێ، لە ژوورەکەدا بووم کە لە پڕ دێوێـك خـۆی بەژوورێـدا کـرد. سەیوان!کوڕەکەی خان. باوڕ بکە وەك دێوێك هاتە بەرچاوم. لەترسان خۆم لـە دەسـتی دەربـاز دەکرد و بە ژوورەکەدا رام دەکرد. دەمقیژان.هاوارم دەکرد. بەڵام کەس بە هانامەوە نەدەهات. تا ئەوەی بوورامەوە. بە جۆرێك کە پزیشکیان هێنایە سەرم. شەرم دەکەم بیلێم، بەڵام تووشی ئازار و ژانێکی سەخت بووم و پێنج رۆژ لە جێگادا کەوتم. خودا لێی خۆش بێت «سروە» خانم کە لەو رۆژانەدا بە سەرسەرمەوە بوو و پەرستاری ئەکردم. بەڵام دایکی سەیوان هـەموو رۆژێ ئازاری زۆری دەدام. هەستم ئەکرد بە دەسـت گورگێکـەوە رزگـارم بـووە و کەوتوومەتـە ژێـر

دەستی گورگێکی دیکە. بە کورتی، ئەزیەت و ئازار لە جەهەنەمی دووهەمدا دەستی پێکرد. سەیوان هەموو رۆژی چێژی خۆی لەمن وەردەگرت و من بە دەستی ئەو زەجرم دەدرام.

رۆژێکی ساردی زستان، لە حاڵێکدا کە باران دەباری، پۆلێك میوان هاتنە ماڵی خان. بنەماڵەی خانێکی دیکە بوون. ئەحمەدخان، بەخۆی و خێزان و کوڕیەوە چەند شەو و رۆژێك لەوێ مانەوە. خێزانی ئەحمەد خان، ژنێکی نەجیب و لەسەرخۆ بوو. بۆ خۆشی پیاوێکی چوارشانەی باڵابەرزی جوانچاس و زۆریش بە بەزەیی بوو. کاوەی کوڕیشیان، کە نزیکەی بیست ساڵ تەمەنی بوو، کوڕێکی لەسەرخۆ و خاوەن زەین و بەئاوەز و دەروون چاك بوو. لەگەڵ هاتنی ئەوان، سەیوانی مێردم بۆ کارێکی گرنگ، بەرەو مەریوان سەفەری کرد و چەند رۆژێکی پێچوو. خێزانی ئەحمەدخانم کەوتە بەر دڵ و لێك نزیك بووینەوە. لە نیگایدا هەستم بە بەزەییەك دەکرد کە بیری جوانییەکانی دایکمی دەخستمەوە. با زۆر سەرت نەیەشێنم. کاوەی کوڕیان لە ژاندارمریدا[٢] کاری دەکرد. یەکێك لە ئەفسەرەکانی پاسگای مەریوان بوو. خەڵکی ئەو سەردەمەش بۆ ئەفسەرەکانی مەریوان و هەورامان رێزی زۆریان دادەنا.

چی بێژم یەلدا! من ژنی سەیوان بووم بەڵام هیچ هەست و خۆشەویستییەکم بۆ خۆی و بنەماڵەکەی نەبوو. لەم بەینەدا تەنیا خەم و گاڵتە و عەزاب، بەشی من بوون. هەموو خۆشییەکانم لێ زەوت کرابوون. بە دیتنی شوەکەم ژیانم لا دەبوو بە دۆزەخ. دەمویست بیکوژم، بەڵام لە خودا و ئاکامی ئەو کارە دەترسام. ئەوە بوو کە نێوانمان رۆژبەرۆژ ساردتر دەبوو. بەڵام بە هاتنی کاوە، هیوایەك کەوتە دڵمەوە. وردەوردە هەستەکانم بووژانەوە . حەزم دەکرد خۆم برازێنمەوە، جل و بەرگی جوان لەبەر بکەم. پێبکەنم و جۆرێکی تر بۆ دونیا بڕوانم. حەزم دەکرد راستییەکان ببینم و ئەشقی راستەقینە ئەزموون بکەم.

ـ مەبەستت چییە؟چۆن چۆنی ئەو ئەشقەت ئەزموون کرد ؟!

ـ مەبەستم خۆشەویستی و هەستکردن بەوەیە کە لە بن پاڵی کەسێکدای کە لە دڵەوە خۆشی دەوێی. تا ئەو کاتەی کە کاوەم نەدیبوو، لەخۆم و لە ژیانم و لە هەموو کەسێکیش بێزار بووم. بەڵام بە هاتنی کاوە، ژیانم گۆڕا. ئیدی بە جۆرێکی دیکە بەڕووی جوانی و ناشیرینییەکاندا چاوم هەڵدەهێنا.

---

٢- بنکەی پۆلیس.

روانینی کاوە، نان خـواردن و دانیشـتنی لەگـەڵم، باسـکردنەکانی، ئەحمـەدخان و خـاتوو سۆسەنیان خستبووە شکەوە. من لە دڵەوە ئاشقی کاوە ببووم. دڵەخورپەیەکی سەیر کەوتبووە دڵمەوە. خۆشەویستی کاوە لە دڵی مندا وەك شەرای هاوینێك بوو کە بەسەر بەفری کوێستاندا بدات. ئای سروە! لامەزەب چی نەکرد ؟!!

رۆژێك سروە هاتە لام و وتی: سەیران! گوڵە جوانەکە، گوێم بۆ رادێرە. ئەزانم چەندە رقـت لە وشەی مێردە. ئەزانم چەندە لە سەیوان بێزاری. بەڵام ئەبێ ئەو راستییە بزانی کە تـۆ ژنـی ئەوی. لە ماڵی ئەودای. هەستم بەوە کردوە کە دڵت لە کاوە چووە. کـاوەش هەروایـە. گـوێ بگرە سەیران! ئەگەر لەسەر ئەو خۆشەویستیە بڕۆی، گیانی هەردووکتان ئەخەیتە مەترسیەوە. کارێکی وا مەکە دایکەکەی جەرگ سوتاو بکەی. وەرە و واز لە کاوە بێنە. سـەیوان هەسـتی بەو کەین وبەینە کردوە. دایکیشی هەر وا. مەگەر نایان ناسی؟ باش ئـەزانی چـۆن ئـابڕووت دەبات. کاوە لە خۆت دوور بخەرەوە بابڕوا بەلای ژیانی خۆیەوە. تکایە. زۆرم خـۆش دەوێیـت. بەڵام ئەم ئەشقە بەلاوە بنێ.

قسەکانی سروە دڵیان شەکاندمەوە. بەڵام خۆشەویستی کاوە زیاتر لەوانەی دەهێنا.

رۆژێکی بەهاری، سۆسەن پێی وتم: سەیران بووکە گوڵەکـەم، ئـەزانی داواکارییـەکم لێـت هەیە؟ ئەمەوێ ببیتە دایك. حەز دەکەم بۆ من و خان نەوەیەك بخەیتەوە. ئیدی لێـت قـەبووڵ ناکەم هەروا بخۆیت و بخەویت و کەیفی خۆت بکەیت!

ئەو داوایەی سۆسەن وەك ئەوە بوو کە لنگە پێڵاوێك بە روومەتمدا بکێشـن. لـە وڵامیـدا هیچم نەگوت و تەنیا بێدەنگیم هەڵبژارد.

رۆژێك کاوە پەیدا بوو:

ـ سەیران مزگێنیم بدەیە، بۆ ماوەی دوو مانگ ئیشەکەم گوازراوەتەوە بـۆ ئێـرە، دەزانـی وەختە لە خۆشیان بفڕم کە هەموو رۆژێ دەتوانم بتبینم!

ـ گوێ بگرە کاوە! بۆخۆت دەزانی چەندم خۆش دەوێیت. لە هەموو دنیا زیاترم گـەرەگی. بەڵام دەمەوێ وازم لێ بێنی.

ـ بۆ چی؟!

ـ چونکە خاتوو سۆسەن ئەیەوێت مندالم بێ تا ماڵەکەیان ئاوەدان ببێتەوە. ئاخر...

ـ بەسە سەیران! دەزانی چەندەم خۆش دەوێیت! من لە پـوورە سۆسـەن و خـان و سـەیوان ترسێکم نییە. داوات لێدەکەم تەلاق وەبگـرە و ببـە خێزانـی مـن. قـەولی شـەرەف بـێ کـە

لەپێناوتدا بمرم. دەزانی چەندەم خۆش دەوێی؟ زیاتر لە قسە خاوێنەکانت. بە قەد ئەستێرەکانی ئاسمان. تۆ وەك ئەستێرەی سیوەیلی، دەدرەوشێتەوە.

ـ گیانەکەم، منیش تۆم خۆش دەوێ. بەڵام ئەگەر بزانن هەردووکمان دەکوژن. دڵنیام.

ـ ئەمە نابێت. کێ ئەم قسە قۆڕانەی فێر کردووی؟ حەتمەن دۆستە گیانی گیانییەکەت، سروە خان!

واز بێنە کاوە، ئەمە راستییەکە.

ـ ئەزانی چییە سەیران! تۆ هێشتا ناتەوێ راستییەکان باوەڕ بکەی. تۆ گەرەکتە خۆ بنوێنی و هیچی تر. تۆ نازانی ژیان چییە. تۆ لە مانای ئەشق نەگەیشتووی. تۆ لەزەتت نەچێشتوە. تۆ دایم لە زەجر و سەرکوتدا ژیاوی. تۆ خووت بە شکاندنی غرووری خۆتەوە گرتوە.

ـ کاوە گیان تێدەگەم مەبەستت چییە. سەرنجی ئەو بارانە بدە. بڕوانە چەندە جوان دەبارێ. لەگەڵ هەر دڵۆپێکیدا گەوهەرێکە کە بە عەشق و ئازادیەوە دەکەوێتە سەر زەوی. دەبارێ، بۆ ئەوەی من وتۆ کەیفی پێ بکەین. دەبارێ بۆ ئەوەی رۆخانەکان پاراو بکات. کانییەکان هەڵتۆقێنێ. گۆمەکان پڕ بکاتەوە. کووچە و کۆڵانیش دەشوات تا من وتۆ پیاسە بکەین و سەرکوڵمەکانمان تەڕ بن. منیش وەك ئەو بارانەم. پێمخۆشە ببارم و تینوویەتی تۆ لە ئەشق بشکێنم. ئەمەوێ سەیوان لەوە بگات کە زیاتر لە ئەو شایستەم. ئەمەوێ بە سۆسەن خانم بڵێم کە مانای شکانی غروور چییە و سروەش تێبگەیەنم کە خۆشەویستی تۆ، زیاتر لە گیانم دەهێنێ.

کاوە هاتە دەنگ و وتی: سەیران! دەڕۆم و ئیدی ئاورێك لە دواوە نادەمەوە. مەگەر بۆ خۆت وەدوام بکەوی یان سۆراغم بگری.

دەستی خستە سەر دڵم و وتی: سوێند بێت بەم دڵە کە پڕ لە خۆشەویستیە. سوێند بێت بەم ئەشقە بەردەوامە، بێژگە لە تۆ، هەرگیز ژن ناهێنم.

ئەمەی وت و چوو.

دەزانی یەلدا! ئەمە جوانترین ئەفسانەی خۆشەویستیی من بوو. پاش ئەوە نزیکەی دوو ساڵ و نیوە نەمدیتوەتەوە. تەنانەت دەنگێگیشم نەبیستوە. تا ئەوەی کە رۆژێك خەریکی گزگدانی هەیوانی ماڵەکە بووم کە سەیوان مەست و دێوانە خۆی بەژوورێکدا گرت. ژنێکی رەشتاڵەی قەڵەو بەدوایەوە هاتە ژوورێ. بە قسەکانیاندا زانیم ناوی شەمسەیە. ئەوان پێکەوە

چوونه ژوورێك و بۆ خۆیان خەڵوەتیان كرد. نەمدەتوانی ئەو دیمەنە تاڵە ببینم. دڵـم دەیگـوت بڕۆم و بیتاسێنم، بەڵام بەرم بە خۆم گرت. پەنام بۆ سروە برد و پێم گوت:

ـ بڕوانە ئەو بێ شعوورە كێی خستوەتە شوێنی خۆی؟

ـ سەیران! وازیان لێ بێنە. ئەو وای خووگرتووە بەردەوام سۆزانی بێنێتـەوە مـاڵی. بـەڵام پاش زەماوەندی ئێوە، ئەمە یەكەم جارە كە دیمەنی ئاوەها دەبینم.

ـ خێرا كە بڕۆ چێشتەكە ئامادە بكە، هاكا خاتوون هات.

خاتوون وتی: سروە! ئەوە باسی كێ دەكەن؟

ـ خاتوون گیان، ئەموت باشترە بڕۆم چایی دەم بكەم.

ـ سروە! بۆچی بە خاتوونت نەگوت كە سەیوان ئەو ژنـەی هێناوەتـە مـاڵ و بـە بەرچـاوی ئێمەوە خەریك بوو ماچی دەكرد؟

ـ سەیران واز بێنە! تكات لێ دەكەم. ئەوەتا خان خەریكە دێت.

ـ باشە، بە جەهەنەم كە هاتن. گوێ بگرە سروە! نازانم چپەچپ چیانە؟

ـ واز بێنە ئافرەت! ئەوە نییە قسەی ئاشقانە ئەكەن!

ـ چەندە بێ چەرداوەڕوون؟

ـ بیریشی لێ مەكەوە سەیران گیان. ئەمانە بنەماڵەی خانن! بەكەیفی دڵی خۆیان دەژیین.

ـ ئەمەوێ لەگەڵ خاتوون قسە بكەم.

ـ سەبارەت بە چی؟

ـ جارێ بەدوامدا وەرە.

ـ لەسەر ئیزنت خاتوون! ئەمەوێ چەند كەلیمەیەك لەگەڵت بدوێم.

ـ وەرە ژوورێ بزانم كارت چییە؟

ـ خانم گیان، دوو سەعات زیاترە كوڕەكەتان ئافرەتێكی هەڵیتەی بردوەتە ژوورەكەی و ...

ـ باشە، دەی چ بووە؟ كوڕەكەم جەوانە. تۆش كە ژنـی ئـەوی بـۆ وازنـاهێنی تـا بۆخـۆی رایبوێرێت!

ـ خاتوو سۆسەن! ئەمە سووكایەتییە كە بەبەرچاوی منەوە وەها هەڵس و كەوت بكەن.

ـ یەڵلا بڕۆرە دەرەوە، بە بەرچاومەوە ون بە!

سروە وتی: سەیران گیان، پێم نەوتی ئەوانە هەرجۆر بیانەوێ ئەژین!

ـ من ئەچمە نهۆمی سەرەوە.

ـ واز بێنه سەیران. خۆت تووشی گێچەڵ ئەکەی.
ـ نا باشتر بزانم چە باسە.

پاش تەواو بوونی قسەکانی من و سروە، ویستم بڕۆمە بەردەرگای ژوورەکەیان لە نهۆمی سەرەوە. هەر واشم کرد. گوێم شل کرد. بیستم کە ئافرەتەکە بە سەیوانی دەوت: گوێ بگرە سەیوان، باشترە لە دەرفەتێکی لەباردا بڕێك ژار بکەینە نێو خۆراکەکەی باوکت و لەناوی بەرین و دەس بەسەر هەموو سامانەکەیدا بگرین. پاشانیش ئەو سەیرانە هەتیوچەیە دەردەکەین.

ـ شەمسە گیان، تۆ خۆشەویستی منی. دایکم شاهیدە کە تۆم چەندە خۆش دەوێ و ئامادەم لەبەر خاتری تۆ سەدانی وەك باوکم بکوژم.
ـ ئەو تاوانە ئەخەینە گەردنی سەیران.

خێرا خۆم گەیاندە سروە و باسەکەم پێ وت. لێشم پرسی کە دەبێ لەو دۆخەدا چی بکەین؟
ـ سروە وتی: تۆ لەسەرخۆ بە و دان بە خۆتدا بگرە و ئەو کارە بە من بسپێرە.

دواتر زانیم کە شەمسە کچە خاڵی سۆسەنە و بڕیار بووە بەر لە مارەکردنی من، ئەو بهێنێت. ئێستا سەرلەنوێ کەین و بەینیان پێکەوە ناوەتەوە.

رۆژێك خاتوو سۆسەن میوانییەکی گەورەی رێك خست. ماڵباتی هەموو خانەکانی گوندەکانی دەوروبەر داوەت بوون. باوك و دایکی کاوەش داوەت بوون کە ئەمەیان بەلای منیشەوە باش بوو. ئامادە کردنی چێشتی میوانەکان خرایە سەرشانی من و سروە.شەمسەش لەوێ بوو. بەرلەوەی چێشتەکە تێبکەین، شەمسە، پێی وتین: ئێوە بڕۆن بحەسێنەوە. من و پوورم بۆخۆمان چێشتەکە تێدەکەین.

ئەو داواکارییەی شەمسە بەلامانەوە سەیر بوو.

هەرکە چێشتەکەیان نایە بەردەمی میوانەکان، خێرا خۆم چووم و خوانەکەی بەردەم خانم لابرد و وتم: خان! ئەم چێشتە ژاراویە. شەمسە ئەیەوێ ژارخواردت بکات و کوشتنەکەشت بخاتە ئەستۆی من.

خان نیگایەکی تێگرتم و وتی: ئەگەر درۆ بکەی لە ماڵەکەم دەرت دەکەم.

بیستنی ئەو قسەیە، ئەویش بە بەرچاوی میوانەکانەوە شەرمەندەی کردم. لەو کاتەدا، شەمسە فرسەتی هێنابوو و خوانەکەی بەردەم خانی گۆڕیبوو.

خان فەرمانی بە یەکێك لە نۆکەرەکانی کە ناوی جافر بوو دا تا لە چێشتەکەی بەردەمی بخوات. جافر بە ترس و لەرزەوە ئەو کارەی کرد، بەڵام هیچ نەقەوما. خانیش فەرمانی دا تا دەست و پێی من ببەستن و لە ژێرخانم بخەن. دوو رۆژ لەوێ بووم. سەیوان و شەمسە، قاقا پێم پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکردم.

پاش ئەو بەسەرهاتە، خان و خاتوون و سەیوان، زیاتر ئازاریان دەدام تا ئەوەی کە رۆژێك گۆزەیەکی ئەنتیکە،بە دەسمەوە داکەوت و شکا. زۆر ترسام. لەپڕ خاتوو سۆسەن گەیشت و گرتمیە بەر لێدان. هەرچی پاڕامەوە بێ سوود بوو.

سەیوان هات و وتی: دایە ئەوە چی قەوماوە؟

ـ هیچ وەڵڵا . ئەم هەتیوچەیە کاسە و کۆزەی بە دەسەوە نەهێشتووم. باشتر وایە تەڵاقی بدەیت تا چیدیکە ئابڕوومان نەبات.

سەیوانیش وتی: جارێ من خەڵاتێکی ئەو قەرزارم. وەرە ئازیزم، وەرە ئەی ژنە میهرەبانەکەم!

ـ چییە سەیوان! چیت لەژێر سەردایە؟

ـ هیچ. ئەو شەوە تۆ بە بەرچاوی باوکم و میوانەکانەوە ئابڕووی منت برد، ئێستا نۆرەی منە کە پاداشت بدەمەوە.

چی بڵێم،یەلدا گیان! ئەو شەوە، سەیوان و شەمسە و دایکی زەجرکوشیان کردم. بە جۆرێك کە عازای گیانم شین هەڵگەڕا و بۆ چوار رۆژ نەمتوانی لە جێگای خۆم بجوولێم.لەو رۆژانەدا ئەوە سروە بوو کە پەرستاری لێدەکردم و بەدیارمەوە ئەگریا. تا ئەوەی رۆژێك خان و کوڕەکەی بوو بە هەرایان و دەنگیان تا دەرەوەش ئەچوو. من وسروە لە ترسان لەرزمان کرد. هاتن و ئێمەیان لە ژوورێکدا زیندانی کرد. پاشان هاتنەوە و دەست و پێی ئێمەیان کردەوە و بەرەو ژێرخانەکە پاڵیان پێوە ناین. پاشان سەیوان لەوپەڕی تووڕەییەوە هات و بەسروەی وت:خان مرد. من ئەوم کوشت. ئەگەر ببینم و ببیستم لەوبارەیەوە شتێك بدرکێنی، ئەوا خۆشت و دۆستە نەشمیلەکەشت(سەیران) وەك خان دەکوژم. باوڕ بکە.

کاتێ بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین، دیمان خاتوو سۆسەن بەدیار لاشەی خانەوە دانیشتوە. زۆر بێڕوحمانە تاساندبوویان. ئەو دیمەنە ترسێکی گەورەی خستە دڵمەوە. کاتێ لاشەیەم بینی، زیاتر ترسام. بەڵام لەبەر خۆمەوە وتم: هەر ئەوەندەت دەهێنا. ئەزانی تۆش چە زەجرێکت دەدام؟

به هاتنی ئەو هەستە، کەمێ هێور بوومەوە هەرچەند چاوەکانم وەك کاسەی خوێنیان لێهاتبوو. لەپڕ خاتوون بۆمی روانی و وتی:

ـ سەیران گیان! ئەزانی ئەم ستەمکارە پاداشی کارەکانی خۆی بینییەوە. تەنیا ئەو کاغەزەم بۆ پەنجەمۆر بکە، هیچیترم لێت ناوێ.

من نەخوێندەوار بووم و نەمدەزانی چی بە چییە؟ پەنجەمۆرم کرد. سەیوان لە ژێرەوە پێم پێدەکەنی.

دایکی پێی وتم: گوڵەکەم، ئەم نامەیە حوکمی ئازادی تۆیە. ئەم ماڵ و مڵکەش هەموو بە ناوتەوە کراوە.

گێلی من لەوەدا بوو کە وامدەزانی راست دەکات. چەند رۆژ شیوەنێکی گەرمیان بۆ گێڕا و وەهایان بڵاو کردەوە کە گوایە خان بە هۆی دووچاربوونی بە شێتیەتی خۆی کوشتوەتەوە. پاش تەواو بوونی سێ رۆژەی عەزاداری، میوانەکان چۆلیان کرد. ئێمە ماینەوە و بێدەنگی.

رۆژێك لە پاڵ سۆپاکەدا دانیشتبووم کە خاتوون قیڕاندی:

ـ سەیران! لە دەرگا دەدەن، دەرگاکە بکەوە.

هەرکە دەرگاکەم کردەوە، دیم کاوە و سەربازێك لەوێ چاوەڕێن! بە دیتنی کاوە لەخۆشیان چاوم پڕ بوو لە فرمێسك. خوایەگیان چە دەمێکی خۆش! لەکەیەوە من و کاوە یەکترمان نەدیبوو. بەڵام کاوە نیگایەکی پڕ لە کینەی تێگرتم و بێ ئەوەی ئاورێکم لێ بداتەوە هاتە ژووری.

ـ سڵاو خاتوو سۆسەن!

ـ سڵاو کاوە ئاغا. ئەوە لە کوێوە؟ بۆچی دەرناکەوی؟ پارەکە دۆست و ئەمساڵ ئاشنا! هەی سپڵە!

ئەو قسەیەی خاتوون، کاوەیان تووڕە کرد. بۆیە وتی:

ـ ئێوە بەدیار نین. سەرتان کردوە بە لاکی خۆتاندا و گوێتان لەو باسانەی پشتەسەرتان ئاخنیوە!

ـ خاتوون لەو قسەیە نیگەران بوو:

ـ ئەوە چی دەڵێی کاوەخان!

ـ من ئەمجارە بۆ سەردانتان نەهاتووم. ویستم پێتان بێژم کە لەمەودوا من و هاوەڵەکان خەریکی لێپرسینەوەین. هیوادارم نەبینە دەردیسەر بۆتان!

کاوە لەسەری چوو و وتی: خاتوو سۆسەن گەرەکمانە هۆکاری مەرگی خان بزانین.

ـ باشە مەگەر لە تازیەکەیدا نەبوون؟ نازانن خان خۆی کوشتوەتەوە! هەموان ئەزانن ئەو لە چ دۆخێکدا بووە!

ــ گوێ بگرە خاتوون، گوایە چەند رۆژ بەر لە مردنی، لە میوانییەکدا، شەمسەی خوشکەزات و سەیوانی کوڕت ویستوویانە ئەو ژارخواردوو بکەن. مەعموورەکانی ئێمە، بەم باسەیان زانیوە.

ـ کاوەخان، باشترە رێز لە من و بنەماڵەکەم بگری!

ـ ئاخۆ ئێوە رێزی خانتان پاراستوە ؟ لێرە بەدواوە یاسا حوکم دەدات و پێوەندی خزمایەتی لەکاردا نییە. ئێوە دەبێ بە خۆت و بووك و کوڕ و خزمەتکارەکەشتانەوە بێن بۆ پاسگا. دەبێ زوو خۆتان ئامادە بکەن.

ترس بە سەرمدا دەباری. هەرچەند کاوە مەلامەتێکی ئەوتۆی نەدامێ، بەڵام هەبوونی ئەو لەو دۆخەدا بۆ من مایەی دڵگەرمی بوو. خاتوون زۆر لەسەر خۆ، خۆی بۆ رۆیشتن ئامادە کرد. وەك بڵێی بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە بۆ پاسگای ژەندەرمە دەڕوات. هەموو پێکەوە بەرەو پاسگا کەوتینە رێ. لەوێ، من و سەیوان لە تەنیشت یەکەوە دانیشتین و خاتوونیش لەو لامانەوە.

کاوە لێپرسینەوەکانی لە منەوە دەست پێکرد.

ـ ئەو رۆژەی ئەم قەتڵە کرا، ئێوە لە کوێ بوون؟

ـ لە ماڵەوە بووم.

ـ ئێوە بە چاوی خۆتان مردنی خانتان بینی؟

ـ بەڵێ.

ـ بەچی مرد بوو؟

ـ خۆی خنکاند.

ـ سروە! ئێوە لە کوێ بوون؟

ـ منیش لای خان بووم.

ــ سەیوان! تۆ رۆژی رووداوەکە لە کوێ بووی؟

ـ لای باوکم بووم.

ـ بۆچی هێشتت خۆی بتاسێنێ؟

ـ نووستبووم کە دەنگێك بەرگوێم کەوت. کە راچەڵەکام، دیم خۆی هەڵواسیوە.

ـ پاش لێپرسینەوە و پرس و وەلامی زۆر، گەڕاینەوە ماڵێ. خاتوون رووی تێکردم و وتـی: سەیران! ئەگەر شتێك بدرکێنی، ئەو کاغەزە ئەخەمە روو.

ـ کامە کاغەز؟!

ـ ئەو کاغەزەی کە پەنجەمۆرت کردوە کوژرانی خان کاری تۆ بووگە.

ـ بۆچی خاتوون، مەگەر من خانم کوشتوە؟

ـ ئەرێ. تۆ لەو نامەیەدا، ئەو کارەت وەئەستۆ گرتوە.

ـ شتی وا چۆن ئەبێ خاتوون! تۆ بۆ خۆت خانت کوشت!

ـ گوێ بگرە سەیران! پەنجەمۆری تۆ بە کاغەزەکەوەیە. نووسیوتە لەبەر رقێك کـە لـەخان هەتبووە، ئەوت کوشتوە. ویستووتە تۆڵەی لێ بکەیتەوە.

ـ تۆڵەی چی خاتوون؟

ـ تۆڵەی دایکت!

ـ بۆچی دایکم؟

ـ با بۆتی باس بکەم سەیران، دڵنیام بە بیستنی ئەم بەسەرهاتە ئیـدی رات سـەبارەت بـە خان دەگۆڕیت. ئەوکات کە من کچێکی جەحێڵی بیست و پێنج ساڵان بووم، لە سـەولاوا، لـە گەل خانی گەورە ئاشنا بووم و لە ناخەوە ئاشقی بووم. بۆیە بڕیارم دا هەرجۆر بێت دڵی بۆ لای خۆم راکێشم. بەلام دایك و باوکی ناڕازی بـوون. لەبـەر ئـەوەی مـن چـەند سـاڵێك لـە ئـەو بەتەمـەنتر بـووم بەهـەزار مـەکافات تـوانیم رازیـی بکـەم. کەچـی حەوتوویـەك بـەر لـە زەماوەندەکەمان، دایکت قووت بوویەوە. هەنگاوی بەرەو هەورامان نەحس بوو. چونکە خانی گەورە ئاشقی ئەو بوو و دڵی لە من گۆڕیا. بڕیارم دا هەر جۆر بووە ئـەو تۆڵەیـە لـە دایکـت بکەمەوە. بۆیە دەستم دایە پلان گێڕی. بێدەنگێ کابرایەکی هەورامیم بۆ سەولاوا داوەت کـرد و پارەیەکی باشم پێدا تا بڕواتە لای دایکت و ئابڕووی بزڕێنێ. بە ئـاواتی ئـەوەی دڵـی خـان بێتەوە سەرخۆ و من بخوازێت. هەر بۆ شەوی دوایی، کابرا هێرشی کـردە سـەری، بـەلام ئـەو خەڵکانەی لە دەوروبەریدا بوون، نەیان هێشت پلانەکە سەربگرێت. هەرچەند توانیبووی بڕێـك ئازاری بدات. کەچی جیقەجیقی دایکت هاوسێکانی وە ئاگـا هێنـابوو و ئـەوان هـاتبوون بـە هانایەوە.

بۆ بەیانییەکەی خۆم گەیاندە هەورامان و ئەو باسەم بەلای خـان و بنەماڵەکەیـەوە گـەورە کرد. وام پیشان دا کە ئەو ئافرەتە کەسێکی خوێرپلەی پێ باشتر بووە لەخان و قەوڵی پێداوە. بەوجۆرە تـوانیم ئـابڕووی دایکـت ببـەم و خـانیش لـە بڕیارەکـەی پەشـیمان بکەمـەوە. بـۆ بەیانییەکەی خالۆ ئەکبەرت لـە شـەرمان هـەڵات و سـەری خـۆی هـەڵگرت و بەرەوهـەولێر گەڕایەوە. بەڵام بە فیت و هاندانی من، خان،دایکتی بە بەرچاوی عالەمەوە فەلاقە کرد. ئەوە بوو کە من توانیم بەوجۆرە تۆڵەی خۆم لە دایکت بکەمەوە. هەر بۆیە تۆش هەقتە ئەگـەر تـا رادەیەك بە کوژرانی خان ئاسوودە بیت و کەیفی پێ بکەیت..

بە بیستنی ئەو باسە هەناسەم سوار دەبوو. دەمویست چەقویەکی تیژ بنێمە ملی. ناهەقم نەبوو یەلدا! بیستنی ئەو قسانە و ئاگادار بوون لەو رازە، لە مەرگیش ناحەزتر بوو. زانیم کـە هەموو بەدبەختیەکانم لە ژێر سەری ئەم عفریتە دایە. ئەزانی! ئەو دایکـە جـوان و دلۆڤـان و بێگوناحەم، چۆنچۆنی کەوتۆتە بەر پلان و ئازاری ئەو ژنە؟! بـە بـێ تـاوان، ئـابڕووی بـردوە! پێشتر بیستبووم کە گوایە بەو هۆیەوە کە دایکم بە نەخۆشییەکی وەگوێز[٣] دووچار بووە، بۆیە ئەو عالەمە خۆیان لێ پاراستووە. بەڵام ئەو دەم تێگەیشـتم کـە ئـەو خۆپاراسـتنە بـە هـۆی کاریگەریی ئەو پلانانەوە بووگە. ماوەیەك پاش بیستنی ئـەو رازە، بڕیـارم دا خـاتوو سۆسـن بکوژم. شەوێکی باراناوی، کە بۆرانی دەکرد، تا بەیانی خۆراس نەچووە چاوم و تەنیا گریـام و نالآندم. ئەرێ یەلدا گیان! ئەوەش بەسەرهاتی دایکە کلۆڵەکـەم؟ ئـاخۆ چـەند ژنـی دیکـەش هەربەوجۆر، لەوپەڕی بێتاوانییەوە، ئاوەها ئازار درابن؟ چۆن چۆنی کەوتبنە بـەر شـەپلآخەی رۆژگار و تا ئاخری تەمەنیان تاوانی گوناحێکی نەکردوویان دابێتەوە؟! ئیدی یەلدا گیان! چـۆن لێم دەپرسی بۆچی نیگەرانی؟! مەپرسە بۆچی چاوەکانت غـەرقی فرمێسـکن! مـەڵێ ژنێکـی جوانخاسی وەك تۆ بۆ دەبێ لە کپیدا بتاسێ!؟ دەردەکی من ئەوەیە. ئاخۆ ئەگەر ئەو شەوە بەرم بە هەستەکانی خۆم نەگرتایە، ئێستا چارەنووسم چی دەبوو؟!

ئەو شەوە من بەرانبەر بە خاتوو سۆسەن وەستابووم و نەمدەزانی دەبێ چی بکـەم. سـوور دەمزانی کە خاتوون و سەیوانی کـوڕی قـاتڵی خـانن. بـەڵام ئەگـەر بـەلای کـاوەوە شـتێکم بدرکاندایە، ئەوا خۆیشم پێوەدەبووم. منی ساویلکە ئەو کاغەزەم پەنجـەمۆر کردبـوو. ئـەزانی

٣- وەگوێز: موسری. ئەو نەخۆشییەی کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە ئەگوازرێتەوە.

چییه یەلدا! منیش بە تووشی چارەنووسەکەی دایکم دەبووم. حەتم چارەنووسی دایك و کچـێك ئەوە بووە کە هێلێکی رەش بەسەریاندا بێت.

هەرچەند لە کۆتایی باسەکانی ئەوشەوەدا سۆسەن پێی وتم" لەگەڵ هەموو ئەوانەشـدا کـە بۆم باس کردی، خۆت سەرپشکی. دەتوانی دەم قورس بیت، یان ئەوەتا بڕۆیت و هەموو شتێك بدرکێنی.

دواتر چوومە بەر پەنجەرەکە و بەدەم گریانەوە بە بیرەکانمدا رۆ چووم. نەمدەزانی ئەبێ چـی بکەم؟ دەبوا سبەینێ سەر لەنوێ بڕۆمەوە پاسگا. ئاخۆ دەبێ هەروەها کپ بکەم، یـان ئـەوەتا وەزار بێم و هەموو راستیەکان بدرکێنم. جگە لە هاوەڵەکـەم مینـا، هـاودەمێکم نـەبوو کـە مەحرەمی رازەکانم بێت و بتوانم رازێکی بەلاوە بدرکێنم.

مینا،دۆستی گیانی بەگیانیمە. لە سەردەمی منداڵیەوە بەیەکەوە، لەگەڕەکێکـدا گـەورە بووین. ئەو کات کە من لەژێر ئازاری باوەژنەکەم" شکۆفەدا بـووم، بێجگـە لـە مـاڵی ئـەوان پەنایەکی دیکەم نەبوو. دایکی مینا" دایە مەلیحە، ژنێکی زۆر باش بوو. بەقەد مینای کچی منیشی خۆش ئەویست. ئەوە بوو کە سفرەی دڵم بەلای میناوە کردەوە و ئـەو رازەم بەلایـەوە درکاند و باسی کاوەشم بۆ کرد.

ئەویش وتی: بە قازانجتە ئەگەر هەموو شت بۆ کـاوە بـاس بکـەیت. تەنانـەت رازی ئـەو کوشتنەش.

بەیانی چوومە پاسگا. نۆرەی لێپرسینەوەم گەیشت. کاوە، وەك بـێ لایـەن خـۆی پیشـان دەدا. پرسی:

ـ خانمی هێژا، بڵێن شەوی قەتڵەکە لە کوێ بوون؟

وەزار نەهاتم و بێدەنگ بووم.

کاوە وتی: سەیران، ئەزانم ئاگاداری هەموو راستییەکانی. باشتر وایە ئـەو راسـتییانەم بـۆ باس بکەیت.

بێدەنگ بوومەوە.

کاوە وتی: سەیران! دوێنێ مینا هات و بەر لە خۆت هەموو شتی بۆ باس کردم. ئەو پێـی وتم کە تۆی نەزان، چە گرفتێکی گەورەت بۆخۆت درووست کردوە. بەڵام دڵگران مەبـەو دەبـێ هاوکاریی من بکەیت. تێگەیشتی؟ بەرژەوەندی تۆ لەوەدایە کەهاوکاریی من بکەیت.

ـ من بەڕاستی نەمدەویست شتێك بڵێم، بەڵام ناچار بووم. ئەوە بوو بەدەم لەرزەوە، هەموو شتم بۆ کاوە باس کرد. نەمدەوێرا سەیری چاوە جوانەکانی بکەم.

کاوە وتی: گوێ بگرە سەیران! من ئەو بنەماڵەیە چاك دەناسم و دەزانم چۆنن. سەیوان، هەرچەند شووی تۆیە، بەڵام کەسێکی گەوج و ناحاڵی و بێ شعوورە. باش ئاگاداری خۆت بە. ئەگەر بزانن بەلای منەوە شتێکت وتوە، دەتکوژن.

نیگاکانی کاوە، هێوریان دەکردمەوە. دەم و چاوی لیپی بەزەیی و ئۆقرەیی بوو. نیگایەکی تێگرتم و وتی:

ـ سەیران! بڕوا بکە خۆشم دەوێی. بە هەموو گیانمەوە دەمەوێ بەلاتەوە بمێنمەوە و تەنانەت پێمخۆشە داواکارییەکی زووشم دووبارە بکەمەوە. دەمەوێ داوات لێبکەم لە سەیوان جیا ببیتەوە. لانیکەم لەبەر خاتری گیانی خۆت. چونکە ئەوانە شتێك لە مرۆڤایەتی بە سەریاندا نەچووە. بە تایبەت خاتوو سۆسەن و کوڕەکەی سەیوان. ئەوانە هەست بە هەر لەمپەرێکی سەر ڕێگایان بکەن، لای دەبەن. بەتایبەت تۆ کە بۆ ئەوانە نرخێکت نییە.

من هەموو شتم بۆ کاوە باس کرد. ئەویش بڕیاری دا کە پارێزگاریم لێبکات. بەڵێنی پێ دام کە نەهێڵێ مافم زەوت بکرێت. بەڵام ئەبوا بۆ ماوەیەك بێدەنگی هەڵبژێرم تا سەبارەت بە بێ‌گوناحیم، بەڵگەی پێویست کۆ بکەمەوە. هەر بۆیە هەوڵی زۆرم ئەدا ئەو نامەیە بدۆزمەوە کە پەنجەمۆرم کردبوو. ئاخرەکەی ڕۆژێك لە ڕۆژان دۆزیمەوە.

شەوێك سەعات دووی نیوە شەو بوو کە سەیوان هاتە لام و وتی: سەیران! هاوسەرە ئازیزەکەم، ئەزانی چیت کردووە؟ تۆ خۆتت بە کوشتن داوە!

وتم: سەیوان بەسە. سەبارەت بەچی قسە ئەکەی؟

ـ سەیران! ئەمڕۆ جەوادی هاوەڵم ئاگاداری کردم کە تۆ بە سەر پردەکەوە لەگەڵ کاوەدا قسەت کردوە. بڵێ بزانم باسی چیتان کردوە کە ئاوەها بە دزی من و بنەماڵەکەمەوە یەکتریتان بینیوە؟ تۆش هەروەك دایکت بێ ئابڕوویت و دیارە چارەنووسی کەسانی بێ ئابڕوو چی دەبێ؟! هەتیوچەی گەوج، ئەگەر من و بنەماڵەکەم نەبووینایە ئێستا خۆت و ئەو باوکە گەوجەت لە برساندا مردبوون.

ـ نەخێر وانییە! ئەگەر تۆ و بنەماڵەکەت نەبوونایە، ئێستا من و باوکم ژیانێکی ئابڕوومەندانە و ئاسوودەمان هەبوو. پاش ئەو هەموو زەجر و داخە، ئێستا وا کراینە قاتڵیش؟!

لەوکاتەدا گیانم گەیشتبووە بینەقاقەم. هەرچی لە دەمم دەرهات پێم وت. نەمدەویست خۆم لە هیچ بدزمەوە. پێم وت کە لە پلانەکانی دایکی سەبارەت بە دایکم ئاگادارم. ئەو کاغەزەشم دۆزیوەتەوە و دڕاندوومە کە پێیان واژوو کردبووم. ئاگادارم کردەوە کە ئەگەر بۆ جارێکی دیکە دەستم لێ بەرز بکاتەوە، هەموو راستییەکان بەلای کاوەوە باس دەکەم. دڵنیاشم کردەوە کە ئاخرەکەی رۆژێك تۆڵەی خۆم و دایکم ئەکەمەوە.

یەلدا گیان، چاوت رۆژی رەش نەبینێ. نیوەشەوی ئەو شەوە، سەیوان هات و گرتمیە بەر لەقە و لێدان. لە تاو هاوارەکانم دایکیشی لە خەو هەستا و پێکەوە کێشیان کردمە ژێر زەویەکە و بۆ ماوەی چوار رۆژ زیندانیان کردم. ئەو روومەتە جوانەم، کەوە و رەش هەڵگەڕابوو. وەك بایجانی لێهاتبوو. بە بنمیچی بانەکەوە هەڵیان واسیم و دامیانە بەر شەلاق[٤]. عازای گیانم رەش داگەڕا. زمانم وەستا و چاوم گێچکەی دەکرد. پاش ئەو چوار رۆژە، دەریان هێنام و ئاگاداریان کردم کە چی دیکە بۆم نییە لەگەڵ کاوەدا قسە بکەم. تەنانەت بۆ لێپرسینەوەش.

ئیدی من لە دۆخی دیلێکدا بووم. مافی قسە کردنم نەبوو. تەنانەت بۆشم نەبوو لە ماڵ بترازێم. تا ئەوەی رۆژێك کاوە هات و داوای کرد کە من بۆ لێپرسینەوە برۆمە پاسگا، بەڵام خەسووم ئیجازەی نەدا .

کاوە وتی: خاتوون گیان! گوێ بگرە، لەوانەیە من و تۆ پێکەوە خزم و ناسراو بین، بەڵام لەمجۆرە دۆخانەدا یاسا ئەو شتانە ناخۆنێتەوە. ئێستا دۆخەکە جیاوازە. من لە هەموو رووداوەکانی نێو ئەم ماڵە ئاگاردارم. بەس ئەمەوێ خۆتان بە ئیرادەی خۆتان بێنە پاسگا و دان بە راستییەکاندا بنێن.

هەرکە دایکی سەیوان ئەو قسەیەی بیست، هەڵچوو و وەك گورگە هارە پەلاماری منی دا. دەیویست بمکوژێت. بەڵام کاوە بەرەنگاری بوویەوە. هەمووومان پێکەوە بەرەو پاسگا دراینە بەر، و لەوێ چەند پرسیارێکمان ئاراستە کرا، بەڵام هیچکامیان دانیان بە کوشتنەکەدا نەنا. پاش ئەوە، باسەکە بۆ ماوەیەك وەستا. دواتر تێگەییشتم کە بە پارە بەرپرسی پاسگاکەیان لە خشتە بردوە. ئەوان هەرچیان لە دەس دەهات درێخییان نەدەکرد. رۆژێك، سەیوان و خاتوون و

٤- شەلاق: قامچی.

شەمسە، بەگیریان هێنام تا ئاگاداری رۆچوونی بابەتەکە بن، بەڵام من شتێکم نەدرکاند. ئەوە بوو دووبارە بردمیانەوە ژێرخانە بۆرەکە. لەویّ شەمسە هالاّوی دەمی تێکردم:

ـ سەیران! تۆ زۆر دڵبەری. بەڵام هەر بەو رادەیەش چارەڕەشی. ئێمە ئاگاداری ئەوەین کـە تۆ و کاوە پێکەوە کەین و بەینتان هەبووە و تۆ ویستووتە هەموو شتێکی بـۆ بـاس بکـەیت. باشترە لە کاوە بخوازیت وازمان لیّ بێنیّ، ئەگینا لە قاوتان دەدەین و ئابڕووتان دەبەین. ئێمـە خانمان کوشت، داماو! ئەگەر بمانەویّ کوشتنی تۆ ئەوەندە ناهێنیّ!

لە حاڵێکدا کە هازێکم بۆ نەمابوو و خۆم پیّ رانەدەگیرا، خاتوو سۆسەن وتی: گـویّ بگـرە هەتیوچەی بەدبەخت، تۆ هیچ کوێت نییە پەنای بۆ بەری. هەر وەك دەزانـی باوکـت تـۆی بـە ژێرخانێك فرۆشت. باشتر وایە خوشت بکوژیتەوە یان بەرەو شارە دوورەکان هەڵبێی.

ئەو دوانە، هەرچی لە توانایاندا بوو ئازاریان دام و گەڤەیان لێکردم. سەیوانیش وتی: گویّ بگرە سەیران! باوکت هاتوەتە لام و دانی بەوەدا ناوە کە کاوە لە ئـەوی خواسـتوە تـا تـۆ لـە دەستی ئێمە ئازاد بکات. ئێستە بێژە بزانم! ئێمە قاتلین؟ ئەریّ؟!

لەپڕ لەدڵم دا خورپا کە هێشتا لە دڵی کاوە دام، بەڵام پەلاماری سەیوان و شەمسـە ئـەو خەیاڵەیان لیّ تێکدام. سەیوان بە لەقە نیشتە سەرم و شەمسەس چنگی کوتایە نـاو قـژەکانم. بێجگە لە هانا بردن بۆ خودا، پەنایەکم شك نەدەبرد. لە پڕ کەوتمە بیری باوکم و بڕیـارم دا لـە دەرفەتێکدا سەردانێکی بکەم.

بە بینینی فەرەجوڵڵا کە خۆی بـە بـاوکم ئـەزانی و ماڵـە کۆنەکـە و دارهەنجیرەکـە، کـە رەزێکی تێئاڵا بوو، هەروەها دیتنی قاڵییە بچکۆلەکە و دیوار و دەلاقە و چڵە هەنارەکانی بەر دەلاقەکە، بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیم زینـدوو بوونـەوە. بـەدەم ئەوانـەوە، دۆخەکـەی خۆمم بۆ باوکم باس کرد.

ـ باوکە، شەرم دەکەم بە تۆ بێژم باوك! من تا ئێستا تۆزقاڵێك بەزەیی باوکانـەم لـە تـۆدا نەبینیوە. ئەگەر هەتبوایە، نەتدەهێشت شکۆفە بە بەرچاوتەوە ئاوەهام پیّبکات. یان بـە بـیّ گوێدانە ویستی خۆم، بە ماڵی خانت نەدەفرۆشتم و وەك بووەکڵەیەك، بە پارەت نەدەدام. یـان ئێستاش نەدەچوویت ئەو باسانەی کاوەیان بۆ ببەیت.

باوکم بە بیستنی ئەو قسەیە هەڵچوو و شەقەزیلەیەکی تونـدی لێـدام و وتـی: تـۆش وەك دایکت چەرداوەڕوویت. تۆ ئێستا ژنی کوڕێکی باشی. لەگەڵ ماڵباتێکدا دەژیـت کـە هـەموو عالەم خۆی بۆ دەکوتێت. چۆن توانیوتە رازی ژیانی خۆت بۆ هەرزەکارێکی بـەرەڵڵا بـەریت و

لەگەڵی بکەویتە خۆشەویستی. وا ئەزانی من گەوجم و ئاگـاداری هـیچ نـیم؟ تـۆ نامووسـی سەیوانی کوڕی خانی! ئەم راستیە ببەرە مێشکتەوە. دەزانی خەریکی چـیت؟ وا دەزانـی مـن ئاگاداری کەین و بەینی تۆ و ئەو کوڕە نیم؟ ئەڵبەت ناهەقیشت نییـە، تـۆ لـە داوێـنی ئـەو نەگبەتە کەوتوویتەوە. لە رەگەکانی تۆشدا تووی ئەو رەوشتە چێنراوە.

حەزم دەکرد دان بەخۆمدا بگرم، بەڵام نەمتوانی. ئەو خەریك بوو بێ حورمەتی بە دایکـم دەکرد. ئەوە بوو کە هەرچی لە توانامدا بوو پێم وت و بە جێم هێشتن.

ئەوەیە بەزەیی و هەستی باوکانەی باوکی مـن، یەلـدا! هـەرگیز هەسـتی باوکانـەم لێـوە نەبینیوە. دەبینی کە من لە وەها دۆخێکدا کە پڕ لە زەجر و بێ کەسی و نەهامەتیە، دەژیـم. ئەوە لە باوکم. زرق و برقی ماڵە خانیش خەریکە دەمتاسێنێ! هەرچەند زیندووم، بەڵام دەفـن کراوێکی زیندە بەگۆڕم. ئەوان تابووتەکەی من بە دوای خۆیاندا رادەکێشن. ئەوەیـە کـە لـە هەموو شت بێزارم. دەبینی کە یەلدا! بۆ روومەتم بڕوانە، جوانە، جل و بەرگەکەشم گران بایین، زێڕیشم بە خۆمدا کردووە، لەوانەیە ئەمانە وەك هێمای خۆشبەختی مـن بخوێنرێنـەوە! ئـەدی بۆچی ئەو دڵەم بۆ تاوێکیش سوکنایی ناگرێ و ئاسوودە نابێت؟! یەلدا گیان! بگرە ئەو هەرا و هاوارە و خت و بووڵەیەی من بە ناهەق بن، چونکە ئەمە چارەنووسی ژنـی کـوردە! ئـافرەتی کورد، دەبێ بەردەوام بێدەنگ بێت و گوێڕایەڵ. دەبێ ئەو خۆی بە سامان و مڵکی کەسـێکی دیکە بزانێت! ئەو دەبێ بەردەوام دایکێکی لەخۆ بـردوو و هاوسـەرێکی وەفـادار و کابـانێکی باش بێت. ئەو دەبێ بەردەوام چەند هەنگاو بەدوای شـووەکەیەوە بێـت، ئەگـەر بێـت و پـێش بکەوێت، ئەوا دووچاری تاوان بووە! ئەو دەبێ گوێڕایەڵی برا و باوك و کوڕەکەشی بێـت! نـابێ زۆر دەربکەوێت و لە کۆڵان و بازاڕدا بکەوێتە بەرچاوی خەڵك! دەبینی یەلـدا، ئـەوە نەریتـە! ئەبێ بەسەر ئافرەتدا بسەپێت!

یەلدا: باشە سەیران! دەی کە ئاوایە بۆچی تەڵاقت نەگرتوە، یان بۆچی تەڵاق ناگری؟!

ـ نا یەلدا! ئەوەت لە من نەوێت کە بۆخۆی سەرەتای چارەڕەشیە! تەڵاق لۆمە و ریسـوایی بەدواوەیە. ئیدی ئەبیتە بێوەژن! ئەوکات دەبیتە بنێشتە خۆشەی نـاو دەمـی خـەڵك! دەبیتـە

کەسێك کە شایەنی ماڵەخان نەبووە. لە نەریتی ئێمەدا تۆ ژنی، بە تارای سوورەوە ئەچیتە ماڵە بەخت و ئەبێ بە کفنی سپیەوە بێتە دەری[٥].

سەیران گیان! دەبێ خۆڕاگر بیت و لەگەڵ ئەو فکرە قۆر و چەوتانەدا بەرەنگاری بکەیت. دەبێ بەر لە هەر کەسێك ئاشقی خۆت بیت. پاشان دەبێ لەوانەش ببوری کە ئازاریانداوی. پێویستە لە باوکیشت ببووری. ئەگەر نەیزانیوە چۆن چۆنی خۆشی بوێیت و چۆن لەگەڵتدا باش بێت. ئەوە نەریتە و لە نێو گەلان و کولتوورەکاندا ئەو شێوازی هەڵسوکەوتە فەرق دەکات. هەرچەند باوکت دەرهەق بە تۆ توندوتیژیی نواندووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوکتە. دەبێ باوك بانگی بکەیت و لێی ببووری. ئەبێ باوەڕ بکەیت کە ئەو هەر ئەوەندەی زانیوە. ئەبێ لە خۆتدا هێزی لێبوردن گەشە پێبدەیت نەك هێزی تۆڵە. بەتایبەت سەبارەت بە بنەماڵەی خۆت.

ـ یەلدا گیان! باوکی وا دەناسم کە هیچ خوێندەوارییان نییە، بەڵام زۆر زیاتر لەوانەی کە خوێندەواریان هەیە، خاوەن هەست و فامن. بە باوەڕی من هەست و ئاوەز بە پێوەندیەکی ئەوتۆیان بەخوێندەواریەوە نییە. ئەوە بۆ نەستی مرۆڤەکان ئەگەڕێتەوە. هەڵسوکەوتی منداڵیش بۆ جۆری پەروەردەی بنەماڵە دەگەڕێتەوە.

بەڵام یەلدا! وتم کە من دایکم نەما. کەسێکی ئەوتۆشم نەبوو کە پشتی پێ ببەستم، بەڵام لەو کەلاوەیەدا کە لە بەرد و خاك دروست کرابوو هەستێکی باشم هەبوو، کەچی باوکم ئەو هەستەشی لێ زەوت کردم. حەزم دەکرد لەگەڵ ئەو دۆزەخەی کە ماڵە باوانم بوو رابێم، نەك ئەوەی بخزێمە دۆزەخێکی دیکەوە.

ـ سەیران گیان ئێستا زۆر ماندووی. بەسەر هەستەکانتدا زاڵ بە. ئیدی پێویست ناکات ئەوەندە خۆت ئازار بدەی. نامەوێ رابردوو ئەوەندە داگیرت بکات و دەس بنێتە ناختەوە.

چاوەکانی سەیران لە ئازار و مەینەتی ژیان باسی زۆریان هەبوو. ئەو سەری خستە سەرشانم و هۆن هۆن دەگریا. پێشتر وەها ئازارێکم بە ناو چاوی کەسەوە نەدیبوو.

رۆیشتنی سەیرانم لە پەنجەرەکەوە تەواشە دەکرد. هەوایەکی زۆر ساردی هەبوو و بەفر کلوو کلوو دەرباری و دیمەنی تاریکی شەوی، سپیپۆش کردبوو. بەسەر تەختەکەمەوە راکشام، چاوم بڕیە دەلاقەکە و کەوتمە نێو دەریای بیرەوەریەکانی ئەو رۆژەم. دیمەنی روومەتی پڕ لە ناسۆر و

---

٥- لە رۆژهەڵاتی کوردستان بووك تارای سووری بەسەردا دەدرێ و ئەگەر بێوەژنیش بێ، تارایەکەی سپی دەبێ.

بیستنی دەرد و ئازارەکانی و دیتنی هۆن هۆن گریان و فرمێسکی چاوەکانی سەیران، بە بەرچاومەوە دەهاتن و دەچوون. بەدەم ئەو مەراقانەوە خەو بردمیەوە.

چەند ڕۆژێك بوو کە مەنیژە لە مەرەخەسیدا بوو و کارەکانی بیمارستانم بە تەنیا هەڵدەسووڕاند. ڕۆژێك، ماندوو و بێ هاز ببووم، بڕیارم دا تەلەفۆنێك بۆ سەیران بکەم. سەیران بۆ خۆی تەلەفۆن(گوشی)ەکەی بەرز کردەوە.

ـ سڵاو سەیران!

ـ سلام. ئێوە؟

ـ منم، یەلدا.

ـ سڵاو ئازیزم، دەحواڵەکەت؟

ـ خراب نیم. ئێوە چۆنن سەیران؟

ـ لەوەتەی ناتبینم، هەست بە دڵتەنگی دەکەم.

ـ کەواتە بۆچی نەهاتی سەردانێکم بکەیت؟

ـ ئەوە منم کە دڵم داگیراوە. تۆ بۆچی؟ وازم لێ بێنە با بە تەنیا دڵتەنگ و خەفەتبار بم.

ـ منیش لەم شارەدا بەتەنیام. ناشتوانم کارەکەم جێ بهێڵم. تۆ هەستە بێ بۆ لام.

ـ کەواتە پاش کارەکەت وەرە. چێشتی شێو ئامادە دەکەم.

ـ مزاحم نابم. پێم ناکرێ سەیران گیان!

ـ مزاحمی چی؟ یەلدا گیان. تۆ ئازیزی منی. لەمەودوا لەتۆ زیاتر کەسم نییە. باسکردنی ناوێ. چاوەڕوانتم. خوات لەگەڵ.

گوشییەکەی دانا. چ هاوەڵێکی باشە. کانگای خۆشەویستی و متمانە و موحیبەتە. ئەو تایبەتیانە، چەند هێندەی دی جوانخاسیان کردبوو.

پاش تەواو بوونی کارەکەم، خۆم ئامادە کرد. چوومە بازاڕ سەوقاتێکی باشم بۆ سەند. کاتێ دیارییەکەم پێدا، شاگەشکەی دەکرد. وتی ئەوە یەکەم دیارییە کە لە هەموو ژیانمدا وەری دەگرم.

پاش خواردنی نانی شێو، گەرەکم بوو بگەڕێمەوە، بەڵام نەیهێشت. بە تەنیا بوو. ئەو شەوە سەیوان نەگەڕابوویەوە ماڵ و لای دۆستەکانی بوو. من بووم و سەیران و منداڵەکانی.

سەیران وتی: یەلدا، حەز دەکەی ئالبۆمی وێنەکانمان ببینی؟

ـ ئەی چۆن. زۆریش خۆشحاڵ ئەبم. بیانهێنە با بیرەوەرییەکانی ژیانت دووبارە بکەینەوە.

ـ واز بێنه، کام بیرەوەری؟ ئەگەر دەتەوێ بیرەوەرییە تاڵەکانی ژیانم زیندوو بکەیتەوە، ئەوا لەگەڵتام.

بەدەم تەواشە کردنی وێنەکانەوە، دیم کە مەراقێك قورگی سەیرانی گرتوە، بۆیە خۆی لە قسەکردن دەبوێرێ.

یەکێك لە ڕەسمەکان سەرنجی بۆلای خۆی ڕاکێشام. لە پاڵی سەیواندا پیاوێکی هەڵکەوتە ڕاوەستابوو. زۆر بە بەژن بوو. لە سەیرانم پرسی:

ـ ئەم پیاوە کێیە لە پاڵی سەیواندا ڕاوەستاوە؟

سەیران سەرێکی بادا و وتی: ئەوە کاوەیە.

زۆرتر سەرنجی وێنەکەمدا. بەڕاستی پیاوێکی جوان و هەڵکەوتە بوو. بۆیە لە سەیرانم پرسی:

ـ سەیران! هەر بەراست، ئێستاش خۆشت دەوێ؟

ـ بۆچی خۆشەویستییەك کە لە کانگای دڵەوە بێت، دەسڕێتەوە و کۆتایی پێ دێ؟

ـ باشە کەواتە، بۆچی تەڵاق ناسێنیت و شووی پێناکەی؟ لانی کەم بۆ جارێکیش بووە، تامی خۆشەویستی ئەزموون بکە.

ـ ئەگەر تەڵاق بسێنم، ڕوو لە کوێ بکەم؟ شوێنێك شك نابەم!

ئەگەر ئەوەیە، تا ئەوکات کە سامان دەگری دەتوانی لای من بمێنیتەوە. بەڵام وردی منداڵەکانت بەرەوە، دەتوانی دڵیان لێ بەربدەی؟

ـ نازانم یەلدا؟ هەرچەند ئەوان گەورە بووگن و دەتوانن بەسەر پێی خۆیانەوە بوەستن. بێجگە لەوەش، ئەوان زیاتر بە دایەگەورەیانەوە هۆگرن.

ـ ئەرێ سەیران. منیش هەستم کرد کە ئەوان زۆر بە دەوری تۆدا نین. ڕەنگە هی ئەوە بێت کە پێوەندیت لەگەڵیان باش نییە.

ـ نا ئەوە نییە. لەبەر ئەوەیە کە دایە گەورەیان، بەلایانەوە منی شکاندوە. منی لەبەر چاویان خستووە.

ـ چۆن ئەبێ سەیران! منداڵێك لەداوێنی دایکێك بکەوێتەوە و لە کۆشیدا گەورە بکرێت، چون پشت لە دایك دەکات! شتی وا نابێ.

ـ تێبگە یەلدا. هیچ منداڵێك نییە دایکی خۆی خۆش نەوێت، مەگەر ئەوەی کە لە داوێنی ئەو نەکەوتبێتەوە.

ئەو درکاندنەی سەیران خستمیە دڵەڕاوکێوە.

ـ چۆن ئەبێ؟ مەگەر چنوور و شاهۆ منداڵی تۆ نین و لە داوێنت نەکەوتوونەتەوە؟

ـ حەز ئەکەی بزانی؟ ئەوان رۆڵەی من نین، بەڵام بە قەد دایکێکی راستەقینە خۆشم دەوێن.

ـ چی چی؟ تۆ دایکی ئەوان نیت؟!

ـ نا. وتم، ئەوان منداڵی من نین.

ـ یانێ چی؟ بۆچی سەیوان بەر لەتۆ ژنی دیکەی هێناوە؟

ـ لێرە نا. لە مەریوان هەیبووە. ئەو راستییەشی لە من شاردبۆوە. نزیکەی پێنج مانگێك لە ژیانی هاوسەریمان گوزەرابوو کە رۆژێك، شەمسە، بۆ نانی نیوەڕۆ بوو بە میوانمان. بەدەم نان خواردنەوە، خاتوو سۆسەن تاریفی خواردنەکەی منی دەکرد. ئەوە شەمسەی تووڕە کرد. وتی:

ـ پووریێ، رەنگە بووکەکەت ویستوویەتی بە دروستکردنی خواردن، لای ئێوە خۆی ئازیز بکات.

منیش هاتم بە دەما و وتم: جا ئەوەی بۆ چییە، ئەگەر سەیوان منی نەویستایە، ئەهاتە داوای تۆ.

ـ نا خانمی خانمەکان! ئەوان تۆیان نەهێناوە لەسەر تەختت دانێن و نازت بکێشن، ئەوان تۆیان بۆ کلفەتی هێناوە.

سەیوان هاتە دەنگ و وتی: واز بێنە شەمسە، ئەو خێزانی منە و خۆشم دەوێ.

شەمسە قەڵس بوو. وتی: سەیوان خان، ئەگەر خۆشت بویستایە، قەد درۆت لەگەڵ نەئەکرد.

ـ درۆی چی؟

ـ باشترە لە خۆتان بپرسن!

منیش کەوتمە دڵەڕاوکێ و پرسیم: درۆی چی شەمسە خانم؟

ـ دەزانی چییە سەیران خانم! سەیوان خان بەڕادەیەك هاوسەرەکەی خۆش ویستووە کە حەزی نەکردووە بێ تاقەت بێت، بۆیە بەرلە ئەویش هاوژنی هێناوە و دوو منداڵیشی لێی هەیە!

ـ چیت وت؟!

ئەرێ وایە، ئەوەیە ئەو خۆشەویستییە کە سەبارەت بە تۆ هەیەتی.

چیتر خۆم پێ نەگیرا. کەوتمە هاوار و قیژاندن. لەگەڵ شەمسە بوو بە شەڕمان. کەوتینە گیانی یەکتر. دەستمان لەسەر و قژی یەکتر نا. سەیوانیش هەردووکمانی وەبەر شەقان دا.

خاتوو سۆسەن هاتە بەردەمم و وتی: سەیران، ئەوە ئەو داد و هاوارەت لەچییە؟ چی دەبێ ئەگەر ژنێکی دیکەشی هەبێت.

دەرکەوتنی ئەو راستییە زۆر زۆر تاڵ بوو. دوو رۆژ کەوتمە جێگا. نەخۆش کەوتم و تووشی خەمۆکی بووم.

رۆژێك خەسووم پێی وتم: سەیران! ئێستا کە بەو راستییەت زانیوە، بهێڵە با منداڵەکانیش بێنەوە لای خۆت.

وتم: ئەو هەمووە درۆتان لەگەڵ کردووم. ئەتوانن دایکیشیان بێنن تا من خزمەتی بکەم. چیترتان ماوە لەگەڵمی بکەن!

ـ گوێ بگرە سەیران، ئەگەر هەروا زمان درێژی بکەی، سەیوان دەتخنکێنێ!

ـ باشە، با ئەو کارە بکات. ئیتر بە دەس ئەم ژیانەوە وەڕەز بووم. تاقەتم نەماوە. بەر لەوەی ئەو بمخنکێنێ، خۆم ئەو کارە دەکەم. تا بە دەس ئەم ژیانەوە نەجاتم ببێ.

ئەو جوابە جەنگییەم، بووە هۆی ئەوەی کە دووبارە بکەومە بەر مشت و لەقەی سەیوان. پێم وت:

ـ بۆچی نەت وتبوو ژنت هەیە، منداڵت هەیە!

ـ باشە، بشم وتایە چی دەگۆڕا؟ تۆ کە بۆ باوکت گرنگ نەبووی! ئێوە پێویستتان بە پارە هەبوو. باوکت ئامادە بوو بۆ کلفەتیش بوایە، تۆی بناردایەتە ماڵی ئێمە. بەڵام چونکە منی گەوج ئاشقت ببووم، هاتمە داوات. ئەگینا تۆ و باوکت دەبوو ببوونایەتە نۆکەری ئێمە. دەزانی چییە سەیران؟ پێمخۆشە سەرت پێوە نەمێنێ! ئێستا گەرەکتە راستت پێ بڵێم! ژن دەبوو دەبێ بێدەنگ بن تا نەتوانن سەر بەرز بکەنەوە. پیاویان پیاو وتوە و ژنیان ژن! پیاو دەبێ غرووری هەبێ. کەی وتوویانە ژن دوابەجەنگێ لەگەڵ بکات؟

ـ یەلدا گیان! ئەوە دیوی راستەقینەی پیاوی هەورامیە. ئەوە خووی مێردەکەمە، ئەڵێی چیبکەم؟ ئەبێ بساچم و بسوتێم!

ـ ئەزانی چییە سەیران! ئەو بێدەنگییەت ژیانی لێکردووی بە دۆزەخ. هەر شتێك سنوورێکی هەیە. بێدەنگی لەڕادەبەدەریش باش نییە. تۆ دەبوو هەر لەو رۆژەوە کە باوکت بە

زۆر بەشووی دای بەربەرەکانیت بکردایە. تەنانەت ئەگەر تەمێش کرابایی. دەبوو بتهێشتایێ کەسێکی دیکە بڕیارت بۆ بدات. ئەوەتا ئەو بێدەنگییەت ئەمڕۆی بە دواوە بووە. پێویستە ژیانی خۆت بە هیچ نەگۆڕیتەوە. تۆ خۆت کردوەتە قوربانی باوکت و کوڕەخان.تۆ لە لۆمەو سەرکۆنەی خەڵك ترساوی. هەروەك مەڕێك خۆت خستوەتە بەردەستی سەیوان تا بتخوات. هەر وتووتە با کەسم پێ نەزانێت. ئیدی تۆ خۆت ڕێزی خۆتت نەگرتووە. تۆ خۆتت خۆش نەویستوە. ئیجازەت داوە بێدەنگت بکەن. زۆرێك لەو چارەنووسەت خەتای خۆتی تیایە. ئەبێ شێرانە لەسەر خۆت بکەیتەوە. تۆ ئەبوا ڕاستییەکانت هاوار بکردایە تا عالەم بیزانیایە. بتوتایێ کە کوڕی خانت نەگەرەگە. ئەبوا ڕێزی خۆتت بگرتایە و ئیجازەت نەدایێ تا وەك هەیکەلێك مامەڵەت پێوە بکەن. ئەزانی چییە سەیران! لەو ماوەیەدا کەلێرەم زانیومە کە ژنانی ئێرە، گزگی بەرقین، جل شۆرن، بەڵام بۆ هیچ کارێك خاوەن ڕا نین.

ـ نا یەلدا! زامی من قووڵتر لەوانەیە. زامی من بێ دایکی بوو. من باوکێکی باشم نەبوو. کەسێکم نەبوو کە پشت و پەنام بێت. نەبرایەك، نە خوشکێك،...

ـ نا سەیران، باس لەوانە نییە. تۆ باوەڕت بە خۆت نەبووە. گرفت لێرەدایە کە تۆ دەتەوێ خەڵکی دیکە خۆشبەختت بکەن. ئەدی خۆت چی؟ سەیران گیان! من یاریدەت دەدەم و دەبمە پشت و پەنات. ناهێڵم بەتەنیا بیت. داوات لێدەکەم لەو بابەتەدا ژیرانە بیر بکەیتەوە. نابێ هەست بکەیت کە کەسێکی بەزیوی. هێشتا هەموو شت لە دەس نەچووە. بە باوەڕی من بەزین، تەنیا هەستێکی زەینییە، ئەگینا شکستێك لەئارادا نییە. ژیان وەك رووبارە، دەڕوا. دەبێ مەلە بکەیت و خۆت رزگار بکەیت، ئەگینا دەخنکی. تازە، ئێستاش باشت کردوە کە وەدەنگ هاتووی. زۆرن ئەو ئافرەتانەی کە بێدەنگ بوونیان دەبێتە سەرەتایەك بۆ خۆ کوشتنیان.

هەستم کرد ڕێگاکەم دژوارە. دەبوا ئەو هەستەم لە زەینی سەیراندا پاك بکردایەتەوە. دەبوا بە بوونە هاودەمی، لە ئازارەکانیم کەم بکردایەتەوە.

بەیانی بۆ بەردڵ لەوێ نەوەستام و چوومەوە بۆ دەرمانگا. مەنیژەی هاوکارم لە ئیجازەکەی گەڕابوویەوە. بەردەوام باسی سەفەرەکەی بۆ دەکردم.

ـ یەلدا دەزانی داواکارم هاتوە؟

ـ موبارەکە، بڵێ بزانم چ باسە؟

ـ کە چوومەوە دایکم وتی: کچم" ئەکبەری پوورزات گەرەکیە بێتە داوات.

ـ ئەوە بە ڕاستتە دایە؟

ـ ئەریَ کچم. کوڕێکی باشە. هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ خۆمان گەورە بووگە و باشی دەناسین. خوا بیبەخشیَ، پوورە مینوو. ئەکبەری بەلای ئێمەوە جیَ هێشتوە. دەبیَ ئاگامان لێی بیَ. ئەو پێویستی بە موحیبەتە. چەند رۆژ پێش هاتە لام واکردی. منیش وتم بێت لەگەڵ خۆت قسە بکات. لەو باسانەدا بووین کە ئەکبەر هات بۆ ماڵمان و خۆشی خۆشی خۆی بەماڵێدا کرد.

ـ سلاو مەنیژە!

ـ سلاَو ئەکبەر

ـ چۆنی مەنیژە؟ خوشحاڵم کە گەڕاویتەوە.

ـ منیش بە دیتنی تۆ خوشحاڵم.

ـ مەنیژە، دەمێکە چاوەڕێی گەڕانەوەت دەکەم. راستییەکەی ویستم ئەگەر رازی بیت چەند دەمێك پێکەوە قسە بکەین.

ـ چۆنی پێتان خۆشە. فەرموون.

بانگم کرد: دایەگیان من و ئەکبەر چەند خولەکێك دەچینە دەرەوە.

ـ بەخێر بچن کچم. بێدەنگیَ وتی: مەنیژە هەڵسوکەوتت باش بێت. هۆشت بێت ها...

ـ بە چاوان دایە.

من و ئەکبەر پێکەوە بەرەو پارکی تاقوەسان کەوتینە رِیَ. بەدەم دوان و پێکەنینەوە نەمانزانی چۆن گەیشتینە ئەویَ.

ـ بڕوانە ئەکبەر، ئاخۆ چەندە زەحمەتیان کێشابیَ تا توانیبێتیان ئەم پارکە ئاوها بڕازێننەوە. بڕوا بکە ئاو و هەوای هەورامان، بە شێوەیەکی سروشتی هێندە سازگارە کەمرۆڤ حەز دەکات بیست و چوار سەعات لە دەرەوە بێت. بۆنی گوڵەکان مرۆڤ کەیلی عەشق و خۆشەویستی دەکات.جۆرە باخاتێکی هەیە کە تا ئێستا نموونەیانم لە شوێنێکی تر نەدیوە. لێرە ناتوانی چوار وەرزەکە لەیەك جیا بکەیتەوە، بەلاَم لەویَ" پاییز خاوەن جوانیی خۆیەتی. زستانەکەی زەوی لە بەفر سپی دەبێت. هاوینەکەی خاوەن جۆرەها میوە و جوانی باخەکانییەتی. بەهارەکەشی کە ئیتر مەپرسە، گوڵە و خونچە و سەوزاییی!

ـ چ جوان! دەتوانم بۆ چەند رۆژ ئیجازە وەربگرم و بێمە ئەویَ"؟

ـ بۆچی نا؟ زۆریش باش دەبێت.

ـ لەوێ بە تەنیای؟

ـ نا، تەنیا نیم. دۆستێکم لەگەڵمە.

ـ خەڵکی ئەوێیە؟

ـ نا. پزیشکە، لە تارانەوە هاتوە.

ـ ناوی چییە؟

ـ یەلدا.

ـ شووداره[٦]؟

ـ نا. ئەویش سەڵتە.

ـ هەڵسوکەوتی چۆنە، لەگەڵ خەڵکەکەدا باشە؟

ـ ئەرێ. ئەو توانیویە لە ناو ئافرەتەکاندا هەڤاڵ پەیدا بکات.

ـ کەواتە ئەگەر هاتم دیارییەکی هەر بۆ ئەهێنم.

ـ لەبیرتە ئەکبەر، کە منداڵ بووین چەندە ئازارت دەدام؟ ئێستاش دەتەوێ گاڵتەم پێبکەیت؟

ـ ئەی خۆت! لە بیرتە چەندە خۆت لەوس دەکرد؟ نەم دەوێرا دەستت پێوە بدەم!

ـ خەتای دایکم بوو. ئەگینا دەمتوانی ئاوقەت ببمەوە. هەمیشە دەیوت" ئەکبەر گەورەیە. رۆڵە رێزی لێ بگرە!

ـ ئەگەر وایە،ئێستاش رێزم لێ بگرە و مەڵێ نا.

ـ چووزانم چیت لە دڵایە تا بزانم چۆن بڕیار بدەم؟

ـ مەنیژە، ئەمەوێ خوازبێنیت بکەم! مێردم پێ بکە. هەرچەند لەوانەیە بە بێشەرمم بزانی، بەڵام...

ماوەیەك بێدەنگ بووم. بەڵام بە قسەکانیدا زانیم کە زۆر روون قسە دەکات و لەو دۆخەدا ناتوانێ بە وشەی جوان و هەستبزوێن ویستەکەی خۆی دەرببڕێت. سەردەمی منداڵیم بیر کەوتەوە. زۆر راست و لەسەرخۆ بوو. کچەکان حەزیان دەکرد گەمەی لەگەڵ بکەن. پاش ماوەیەك سەرم بەرز کردەوە و وتم: ئەکبەر، باشە، مێردت پێ دەکەم. ئەمەوێ خۆشبەختت بکەم. ئەگەر بە شیاوم بزانیت..

---

٦- واتە بەمێردە؟

ـ به گیان و بەدڵ..

بەدەم پێکەنینەوە بەرەو ماڵ گەڕاینەوە. دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، ئەکبەر بە شیرینی تایبەت و گوڵی جوانەوە، لەگەڵ مامەیدا هاتنە ماڵمان و بە لای دایك و براکەمەوە خوازبێنی کردم.

ڕاستییەکەی منیش دەس کەمێکم لە ئەکبەر نییە. باوکم نەماوە. خوشکیشم نییە!

ـ ئەی براکەت ئیش‌وکاری چییە؟

ـ براکەم لە خۆم بچووکترە. من کچە گەورەی ماڵم. باوکم چەند ساڵ دەبێ لە پێکدادانی ئۆتومبیلدا مردووە لە دەس داوە. خوا بیبەخشێ. ئەو کات من هێشتا خوێندنم تەواو نەکردبوو. دایکم، هەم دایکم بوو، هەم باوك. لە یادمە کە ئەوکات براکەم زۆر گچکە بوو، زۆر بێ ئۆقرە بوو بۆ باوکم. منیش زەجری زۆرم دەکێشا. ئاخر باوکم وەکوو هەڤاڵێك وا بوو. مەرگی باوکم دووچاری خەمۆکی کردم. بەڵام هەرجۆر بوو زانستگام تەواو کرد.

ــ مەنیژە گیان دەبێ بە وەها باوکێکەوە شانازی بکەیت. ئەو نموونەی باوکێکی باش بووە. ئاسەواری پەروەردەکردنی بە منداڵەکانییەوە دیارە. ئەها.. ئەزانی سەیرانی کڵۆل چی دەکێشێت؟ باشە تۆ واز لەو قسانە بێنە، ئاخرەکەی چە بڕیارێکت دا، شووت پێکرد؟!

ـ ئەرێ. کارمان تەواو بوو. بڕیارە دوو حەوتەی دی مارەبڕین و زەماوەند بێت.

ـ باشە مەنیژە، ئەتۆ ئەو کوڕەت چۆن هەڵبژارد؟

ـ ئەزانی یەلدا، ئەکبەر، کوڕێکی باش و بەبەزەیی و ڕاستە.

ـ مەنیژە، ئەزانی خۆشەویستی زۆر جیاوازە لە ژن و مێردایەتی؟

ـ مەبەستت چییە یەلدا!

ـ ڕاستەکەی، نابێ تەنیا لەبەر ئەوەی کە قەیرەی، ئازا بڕیار بدەیت. ئەبێ بە پێی عەشق و ویست و داخوازی دەروونیت وەها بڕیارێك بدەیت. ئەبێ جۆرێك شوو بکەیت کە خۆشەویستییەکەت ئەوەندە زاڵ بێت تاڵێ و مەینەتییەکانیشی لات شیرن بن. تۆ ئەبێ ئاشقی ئەکبەر بیت، چونکە لەوانەیە لە پڕ هەڵسوکەوتی بگۆڕێت. تەنانەت لەوانەیە دەسیشت لێ بەرز بکاتەوە! ئەگەر ئاشقی بیت زوو لێی دەبووریت. مەنیژە گیان، شووکردن ئاسان نییە،باش بیری لێ بکەوە.

ـ سوپاس یەلدا. بەگوێت دەکەم.

ماوەیەك تێپەڕی. من و مەنیژە خەریکی هەڵسووڕاندنی ئیش و کارەکانی دەرمانگا و نەخۆشەکان بووین. ئەوە چەند رۆژ بوو سەیرانم نەدیبوو، تەنیا توانیبوومان بە تەلەفون پێکەوە قسە بکەین.

رۆژێك ژنێکی نەخۆش هاتەلام. سەبارەت بە نەخۆشیەکەی پرسیارم لێکرد.

وتی: خانم دوکتور، ناوم گەلاوێژە. شەش ساڵ دەبێ شووم کردوە. پێنج کچم هەیە، بەلاّم خودا کوڕی پێ نەداوم. ئێستاش زۆر نەخۆشم. حاڵم باش نییە.

ـ چۆن ئاوات لێ هات؟

ـ ئازاری من دەرمانی نییە دوکتور گیان! تەنیا ئەمەوێ دەرمانێکم پێ بدەیت کە بۆ ماوەیەك ئازارەکەم بسرەوێ. دەرمانێکی ژان بڕ.

ـ باشە ئازارەکەت چییە؟ بە رەنگ و رووتدا شتێك بەدیار ناکەوێ.

ـ ئەعسابم باش نییە خانم! دەرمانێکم بدەرێ کە تۆزێك هێور ببمەوە، بنووم.

ـ باشە لە چی تووڕەی!

ـ هیچ نییە. ئێشی رۆژگارە. وەڵلا بە دەس مێردەکەمۆ زۆرم بۆ هاتووە.

ـ ئەتوانی زیاتر باس بکەیت!

ـ راستییەکەی دوکتور گیان، کوڕی گەرەکە! ئەڵێ ئەگەر کوڕت نەبێت تەلاّقت دەدەم! ئیتر چاوی ئەو پێنج کچە جوانە نابینیێ؟

ـ بۆچی فەرقی کوڕ و کچ چییە؟

ـ نازانم دوکتور. دەڵێت ئەگەر کوڕمان نەبێ وەجاغ کوێر دەبین! دەڵێت پاش مردنمان سامانەکەمان دەکەوێتە دەس زاوا. باوەڕ بکە دوکتور گیان باوکیشم هەروا بوو. ئێمە شەش کچ بووین. تەنیا برایەکمان هەبوو. بەلاّم براکەم هەمیشە لایان ئازیز و گەورە بوو. ئەوەش ئێمەی زۆر ئازار دەدا. ئێستاش شووەکەم هەمان رەوشتی هەیە. دەڵێ ئەگەر کوڕت نەبێ تەلاّقت دەدەم. پەنام بۆ هێناوی تا بەشکەم دوکتورێکی باشم پیشان بدەیت با بڕۆمە لای.

ـ ئەی باشە حەسێبی خەرجەکەت نەکردوە؟ ئەو کارانە پارەی زۆری تێ دەچێ.

ئاژەڵەکەم دەفرۆشم. مارەیی خۆمن. مەڕ و مانگا و هەرهەمووی!

ـ گوێ بگرە خوشکم، دەبێ لەگەڵ مێردەکەتدا باس بکەیت. پێی بڵێ کە ئەو کارەت پێناکرێت و دەس لە کچەکانیشت هەڵناگری. پێی بڵێ کە شایەنی ئەو کچە جوانانە نییە.

وازی لێ بێنه با بڕوات ژنێکی‌که بهێنێ و لێی کوڕی ببێ. بۆچی نازانی که کچێکی سلامەت و خوێندەوار، سەد کوڕی نەشیاو دەهێنێ!

به قسه‌کانم خوشحاڵ بوو. وتی: راست دەکەی دوکتور. ئەوا هات و مەڕ و ماڵاتەکەشم فرۆشت و نەشبوومە خاوەن کوڕ، ئەوکات چی بکەم! باشتر وایه هەر ئێستا به گوێت بکەم.

شەو باسەکەم بۆ مەنیژە گێڕایەوە. پێکەنینی هات و وتی: یەلدا، تۆ لەگەڵ چ کەسانێك سەروکارت هەیه! کچێ خۆ هەر لێرە وانییە، باوەڕ بکە لە شارەگەورەکانیشدا هەیە.

ـ دەزانی مەنیژە! زۆرم بەزەیی بەو ژنانەدا دێتەوە. بە تایبەت ئەوانەی کە خوێندەوارییان نییە و بوونەتە کۆیلەی نەریت! نازانم چۆن چۆنی یاریدەیان بدەم؟

ـ تۆ چیت لەدەس هاتبێ دریغیت نەکردوە، ئەدی نابێ ویژدانت ئازارت بدات.

ـ ئای مەنیژە، ئەم خەڵکە چ ئازارێك دەچێژێ! هەر بەراست ئەمڕۆ سەیران هەواڵی نەپرسی؟

ـ بۆچی نا، لەبیرم چوو پێت بێژم. دەمەو عەسر پێوەندی گرت و وتی پێت بڵێم تەلەفونی بۆ بکەیت.

ـ هەر ئێستاکە تەلەفۆنی بۆ دەکەم. خۆ نەخۆش نەبوو؟

ـ نا. شتێکی باس نەکرد. تەنیا داوای کرد پێوەندی لەگەڵ بگری.

دایکی سەیوان گوشی(تەلەفۆن) ەکەی بەرز کردەوە. سەرم سووڕ ما کە بۆچی خۆی ئەو کارەی نەکرد.

....

ـ سلاو یەلدا خان، تۆ چۆنی، چییە ئەڵێی لێمان تۆراوی سەردانێکمان ناکەی!

ـ نا. وانییە. هاتم، ئێوە تەشریفت نەبوو. نەمویست زۆر مزاحمتان ببم. راستی سەیران لەوێ نییە؟

ـ نا. نییە.

ـ لە کوێیە؟

ـ رۆشتوە بۆ لای مینا.

ـ زۆر سوپاس. ببورن.

ـ تکایە.

تەلەفۆنەکەم داخستەوە. و بەرەو ماڵی مینا کەوتمە ڕێ. بە پرسیارکردن دۆزیمەوە. لەدەرگاکەم دا. مینا دەرگاکەی کردەوە. باڵایەکی مام ناوەندی هەبوو. کولمەکانی خڕو قیت بوون. چاوەکانی سەوز و جوان بوون. ئەگەر چی لە سەیران جوانتر نەبوو، بەڵام میهرەبان و بە هەست و ژیر بوو. بە روویەکی گەشەوە داوەتی کردمە ژووری. خانوەکەیان دڵگروجوان بوو. چەند دیو و هەیوانێك. سەیران لەوێ دانیشتبوو. بە پیرمەوە هات و دەستی کردە ملم. قسەی بۆ نەکرا. گریان قوڕگی گرتبوو. رەنگی بە روومەتەوە نەمابوو. لە پاڵیدا دانیشتم و لێم پرسی:

ـسەیران! تەلەفۆنم بۆ کردی. نەبووی. خەسووت تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. ئەو پێی وتم لێرەی. ئەوە بوو ئازا خۆم گەیاندە لات. ژمارە تەلەفۆنی ماڵی مینام نەبوو. ئەگەر بزانی چۆن ئێرەم دۆزیوەتەوە!

سەیران قسەکانی پێبڕیم و وتی: یەلدا گیان. ئەمە مینایە. ئەو دۆستەی کە بۆم باس کردی. مینا! ئەوەش دوکتور یەلدا کەریمیە.

لەگەڵ مینادا بڕێ چاکوچۆنیمان کرد . پاشان وتی: یەلدا! نان حازرە، بۆت بێنم؟

ـ سوپاس. خواردوومە.

ـ مینا خانم، لە مێژە لێرەی• بەڵام تا ئێستا سەرێکت لە ئێمە نەداوە.

ـ نازانم چۆن بووە. بگرە کەم شانسی بووبێت. سەیران باسی تۆی بۆ کردووم.

سەیران کە ماتی کردبوو، وەدەنگ هات و وتی:

ـ یەلدا دەزانی! من تۆراوم. پەنام بۆ ئێرە هێناوە. بڕیارم داوە کۆتایی بە هەموو شتێك بهێنم. ئیتر گەییشتوەتە بینەقاقەم. ئەمەوێ دالدەم بدەیت و پشتو پەنام بیت.

ـ دەمێکە چاوەڕوانی ئەو بەخۆداهاتنەوەم. دەبێ ئیرادەت هەبێت و متمانە بە خۆت بکەیت.بە باشی بارودۆخەکەت لێكبدەرەوە تا بتوانی خۆت رزگار بکەیت. باشە، شەڕی ئەمجارەتان لەسەر چی بوو؟

ـ بۆچی شتێك ماوە. ئەوە عومرێکە وەزعم بەوجۆرەیە، خوێناو ئەخۆمەوە. ئیتر ناتوانم. سی وشەش ساڵم تەمەنە!

مینا کە لە مەدبەخەکەدا خەریکی ئیش وکار بوو وتی:

ـ یەلدا! سەیران هەرگیز نەیویستوە بۆ خۆی بژیت. هەمیشە چاوی لە دەمی خەڵك بووە. تۆخوا رەوایە سەیران لەو ماڵەدا بژیت؟ ئەو هێشتا لەگەڵ سەردەمی منداڵی خۆیدا ئەژیت و

لەوە دەترسیّ کە کەسێك نەبێت پاڵپشتی لێوە بکات. شوکور ئێستا بەخۆیدا هاتوەتەوە. ئیتر نایەویّ بۆ خەڵك بژیت.

ئەو قسانەی مینا، بە دڵمەوە نووسان. بۆ سەلماندنیان وتم:

ـ دەبیّ سەیران خۆڕاگر بێت و خەڵکی تێبگەیەنێت کە چ جەفایەکی دەرهەق کراوە و دەنگی دەرنەهاتووە.

سەیران دەنگی هەڵبڕی :

ـ شتێك نییە. تکایە ئەوەندەش گەورەی مەکەنەوە. بڕیارم داوە تەنیا تەڵاق وەربگرم. نامەویّ لەگەڵ ئابڕووی کەسدا شەڕ بکەم.

هەستم کرد سەیران زۆر تێك چووە. نیگەرانیی لە روومەتیەوە دەباریّ. بۆ ئەوەی زیاتر نیگەران نەبێت، هەوڵم دا باسەکە بگۆڕم:

ـ راستی مینا خانم! مێردەکەت خەریکی چییە؟

ـ یەلدا خانم، مامۆستایە. بۆخۆشم مامۆستام.

ـ ئەی منداڵتان نییە؟

ـ تازە زەماوەندمان کردووە. دوو ساڵە. سەیرانی داماو دەرسیشی نەخوێندوە. باوکی ئەو دەرفەتەشی پێنەداوە. ئێمە لە منداڵیەوە پێکەوە دۆستین. ئەو پێنج ساڵ لە من گەورەترە. زۆر لە باوەژنی دەترسا. باوکی ئیجازەی نەدا بڕواتە مەکتەب. بە زۆر لە کوڕی خانی مارە کرد. ئێستاش ئەوەیە کە دەیبینی! لە ژیانی هیچ خۆشییەکی نەدیوە. پاش عومرێك ژیانی هاوبەشی، ئێستا دەبیّ بیر لە جیابوونەوە بکاتەوە.

سەیران مات ببوو و هیچی نەدەوت. بەڵام لە کپیەکەیدا دونیایەك هاوار بەرز دەبوویەوە کە کەس نەیدەبیست.

مینا هەروا درێژەی دەدا. منیش بەردەوام چاوم لە سەیران بوو کە زۆر نیگەران بوو.

پرسیم: سەیران! هەست دەکەم نەخۆشی. ئەوەندەت مەراق خواردوە ئیتر بەرگە ناگری. نابیّ ئەوەندەش بۆی دابچی. دڵنیابە تێپەڕینی زەمەن هەموو شتێك چارەسەر دەکات. ژیانێکی باش چاوەڕێی تۆیە.

ئەوە ماوەیەك بوو سەیران لای ئێمە بوو. وردە وردە بەو دۆخە تازەیە رادەهات.لەگەڵ مەنیژە گەرم بوون. ئێمە دڵنەوایی زۆرمان دەکرد و ورەمان پێدەبەخشی. پاش ماوەیەك سەیران بڕیاری دا دوای کاروباری تەڵاقەکەی بکەویّ. لەگەڵ سەیران چووینە ناوەندێکی چکۆلە

که لەوێ بۆ راپەڕاندنی گرفتی خەڵك بونیاد نرابوو. بەڵام کارەکە لەوێ چارەسەر نەکرا. بۆیە چووین بۆ مەریوان. سەیران لە دادگا شکاتی کرد. چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە تا کارەکان رایی بوون. رۆژی دادگاییەکە، سەیران لە هەموو مافەکانی بوورد. سەیوانیش هەر ئەوەی گەرەك بوو. سەیران، تەنانەت مارەییەکەی خۆیشی بەخشی، بە مەرجێك لەو دۆزەخە رزگاری بێت.

ماوەیەك لە هەورامان ژیانمان بە ئاسایی تێدەپەڕی. سەیران کارەکانی ماڵی دەکرد. لە ترسی پرسیار و مەنج و لۆمەی خەڵك، حەزی نەدەکرد بڕواتە دەرەوە. چەند جارێك داوام لێکرد تا سەردانێکی باوکی بکات. بەڵام رازی نەدەبوو. رۆژێك لە دەفتەری کارەکەم خەریکی بەڕێوەبردنی ئەرکەکانم بووم کە لەپڕ پیرەپیاوێك کردی بە ژووردا. حەفتا ساڵێك تەمەنی بوو. سڵاوی کرد و بەسەر کورسییەکەوە دانیشت.

پرسیم: باوکە گیان، نەخۆشی؟

ـ بە فارسییەکی شەلوپەت وتی: کچم روحم نەخۆشە. لەناخمدا هەست بە ئازارێك دەکەم کە بۆ کەس ناسراو نییە. دەبێ تەنیا خۆم پێوەی بتلێمەوە.

ـ ئەو ئازارە چییە باوە گیان، بەشکم بتوانم چاری بکەم.

ـ کچم! راست دەکەی. چارەسەری ئەم ئازارەم تەنیا لای تۆیە. ئەوە تۆی کە دەتوانی لەدەستی رزگارم بکەی!

ـ بلێ ، باوڕبکە درێغی ناکەم. راستی ئێوە کێن!

ـ من فەرەجوڵڵام. باوکی سەیران! پێیان وتووم تۆ کەسێکی بەبەزەیی و باشی. بۆیە هاتووم تا بە هانای منیشەوە بێت.

ـ باوە گیان! ئەزانی چی بەسەر کچەکەتاندا هاتووە؟

ـ ئەرێ کچم! ئەزانم کە تەڵاقی گرتوە. بەو کارەی زۆر خوشحاڵم. ئەو ناکەسانە دەرهەق بە کچەکەم ناپیاوی زۆریان کردوە. شوکور بۆ خوا. ئیتر نەجاتی بووە.

ـ ئەی نازانی ئەوە تۆ بوویت کە کچەکەت تووشی ئەو بەڵایەت کرد؟ خەتاکە هی تۆ بوویت. ئەگەر ئەو کچەت بە زۆر بەشوو نەدابایە، ئاوەهای بەسەر نەدەهات!

ـ ئەزانم کچم. هەر بۆیەشە پەنام بۆ تۆ هێناوە. من دەرهەق بە کچەکەم ستەمکارم. هەست بە گوناحی گەورە دەکەم و زۆریش پەشیمانم. ئەوە چەند رۆژێکە وەك راچڵەکاوم وام. نەخەوم هەیە، نەخۆراك. دایم لە بیری ئەو کچەدام.چەند رۆژ پێش، خەوێکی سەیرم دی! لە خەوما، جلەکانی سەیران دڕاون و زۆر لە تەنگانە دایە. لەو کاتەوە ئۆقرەم نەماوە.خانم

دوکتور، دەستم بە داوێنت، بەشکەم سەیران ڕازی بکەیت بگەڕێتەوە لام. قەول بێ هەموو شت قەرەبوو بکەمەوە. لەبەر خاتری ئەو، شکۆفەش تەڵاق دەدەم. بێجگە لە ئەو منداڵێکی تـرم نییە. هەموو ئەو کەتنانە لە ژێرسەری ئەو عفریتە وەجاخ کوێرەدا بوون. نازانم بۆچی ئەوەنـدە گێل بووم و کڵاوی شکۆفە دەچوە سەرم؟ کچم، منیش باوکم. توزقاڵێکیش هەقم پێ بدە. هەرچەند هەڵەی زۆرم کردوە، بەڵام ئێستا گەییشتوومەتە لێواری پێیەکم لەسەر. پاش خـودا، تەنیا لە سەیران داوا ئەکەم بمبووریت و لێم خۆش ببێ. .. ئای کچە جوانەکەم! ئەزانی چۆن بە دەستی خۆم بەدبەختم کردی!

بەزەییم پێیدا هاتەوە. دەیویست قەرەبووی ڕابردوو بکاتەوە! بەڵام ئیدی شتێك نەمابوو تا قەرەبوو بکرێتەوە! هەرچۆنێك بوو خۆمم ڕازی کرد تا بیبەمە لای سەیران.

لە دەرگای ژوورەکەمان دا. دەنگێکی ناسك وتی: فەرموون.

ئەو دەنگە، دڵی ئەو پیاوەی ڕاچڵەکاند. چووینە ژووری. باوك و فەرزەنـد[٧]، بـە دیـتنی یەکتر بۆ ماوەیەك وشك بوون. سەرسام! پاشان باوك باوەشـی بـۆ کچـەکەی کـردەوە، کەچـی کچەکە دوا دوا لێی دوور دەکەوتەوە. بینینی ئەو دیمەنە سەرسـامی کـردم. ئەمـە هـەر ئـەو باوەشەیە کە منداڵ خۆی بۆ فـڕێ دەدات، ئـاخۆ ئـەو هۆکارانـە چـین کـە ئێسـتا خـۆی لـێ دەدزێتەوە. ئاخۆ ئەمە هەمان دۆزەخ بوو کە باوك بۆ منداڵەکەی نێڵ دابوو؟

دەستی پیرەپیاوەم گرت. بردم و لەسەر قاڵییەکە دامنا. دڵنەواییم کرد تا ئەو هەڵسوکەوتە تاڵەی سەیران فەرامۆش بکات.

سەیران هات و لە تەنیشت سۆپاکەوە دانیشت. باوکە چاوی لـە کچـەکەی هەڵنـەدەگرت. ئاخرەکەی بێدەنگییەکەی شکاند و وتی:

ـ ئازیزم، کچە جگەر گۆشەکەم! بۆچـی لـێم ناپرسـی؟ بۆچـی مەگـەر مـن باوکـت نـیم؟ هەورامان ئەوەندە گەورە نییە کە تۆ نەتوانی سەردانێکی من بکەیت. دەزانی چەندە پەرۆشـت بووم. دەزانم ئێستا لە دڵتدا چە غەوغایەکە؟ دەزانم لێم زویر و تووڕەی بـە جۆرێـك کـە پێـت خۆشە لێرە بمکەیتە دەرەوە! بەڵام ئیجازەم پێ بدە با قسەکانم بکەم. خۆشەویستەکەم، سەیران! لەم ڕۆژانەدا بیستوومە کە تەڵاقت وەرگرتووە. ئەو کارەت زۆر خۆشحاڵی کـردووم. دەزانم کـە تۆ هەر لە سەرەتاوە بەم کارە ڕازی نەبووی. ئەوە خەتای من بـوو. لـە ئاسـتی تـۆدا خـەتا و

---

٧- ڕۆڵە- منداڵ.

ستەمی زۆرم کردوە. ئێستا هاتوم تا ببەخشی. پیر بووم. مردن لێمەوە زۆر نیزیکە. نامەوێ بەو بارە گرانەوە سەر بنێمەوە. ئەوە ساڵێك زیاترە لەماڵەوە کەنەفتم. سوپاسی خانم دوکتور دەکەم کە چاکەی زۆری لەگەڵ کردووی. دەی چی دەڵێی کچم، سەیران! وەرامێکم بدەوە!

سەیران سەری هەڵبڕی. چاوەکانی غەرقی فرمێسك بوون. بەرەو ئەو گوڵەی روانی کە لە گوڵدانی ژوورەکەدا وشك ببوو. وتی: ئیدی من وەك ئەو گوڵە وشك هەڵگەڕاوم. تەنیا دەجووڵێم، قسە ئەکەم، خۆراك دەخۆم... دەڵێی هەمان زیندووم کە لەتابووبێتێکدا بەرەو گۆڕستان دەبرێم. من زیندوو بووم، بەڵام تۆ منت کوشت. منداڵیم، گەمەکانم، ژیانم، خۆشییەکانم، عەشقم، هەر هەمووت لێ زەوت کردم. تازە شتێك نەماوە. سی و شەش ساڵ لە تەمەنم وێران کراوە.

خۆم تێکەڵی قسەکانی ئەوان کرد و وتم:

ـ نا، بەوجۆرەش بیر مەکەوە. لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەو رێخەیە دووبارە چرۆ دەکاتەوە و پەل و پۆ دەهاوێژێ و گوڵ دەر دەکات. دەبێ رابردوو فەرامۆش بکەیت و ژیان لە سەرەتاوە دەس پێبکەیتەوە.

سەیران نەیدەویست خۆی تێکەڵی باسەکانی ئێمە بکات. بە روومەتیەوە خەم دەباری. لە دۆخێکی باشدا نەبوو. بەڵام رووی لە باوکی کرد و یەك بەیەك ئەو هەڵسوکەوتانەی وەبیر هێنایەوە کە دەرهەق بە دایکی و بەخۆی کردبوونی. وەبیری هێنایەوە کە چون بوەتە داردەستێکی ماڵی خان و بوختانی بۆ دایکی هەڵبەستوەو پاشانیش مارەی کردووە. باسی ئەو هەموو زەجرەی کرد کە بە دەسی ئەو و شکۆفەوە چێشتبوونی. پێی وت کە زۆر شەو تا بەیانی نەخەوتوە و هۆنهۆن گریاوە. پێی وت کە بۆ تۆزقاڵێك بەزەیی باوکانە بە حەسرەت بووە. باسی ئەو هەموو زەجرەی کرد کە لە ماڵی خاندا چەشتوویەتی. پاشان وتی: یەلدا! ئەوانە بیرەوەرییەکانی منن لەگەڵ باوکم! ئێستاش شتێکم بۆ نەماوەتەوە. باوکم لای من مردووە.

بۆ باوکی سەیرانم روانی. سەری داخستبوو و نەیدەتوانی بۆی بڕوانێت. نەیدەزانی چۆن وڵامی بداتەوە.

وتی: کچم! هەموو ئەوانە راستن. دەمەوێ ببەخشی! دان بەوەشتدا دەنێم کە رازی هاتنی کاوە بۆ لام و باسی کوشتنەکەی ((خانم)) بردەوە بۆ خاتوو سۆسەن و سەیوان. دەزانم پاش ئەو فیتنەیی کردنەی من چیت بەسەر هاتوە! هەموو ئەو خەتایانە دەگرمە ئەستۆ. بگرە ئەگەر بە

گوێی کاوەم کردبا، تۆ زووتر نەجاتت دەبوو و بە دڵی خۆت شـووت بـە کـاوە دەکـرد. لەگـەڵ هەموو ئەوانەشدا سوێندت دەدەم ببەخشی. من شایستەی ئەوە نـیم کـە بـاوکی تـۆ بم. تـۆ فریشتەیەکی بێ گوناحی.

سەیران هەستا و بەرەو دەرگاکە چوو. لایەکی کردەوە و وتی: باوکە! سـەبارەت بـە کـاوە، هەرگیز لێت نابوورم. چونکە ئەوم لە ناخەوە خۆش دەویست. لەگەڵ ئەودا دەحەسامەوە. ئەو دەیتوانی جێگای باوك ودایکم بگرێتەوە. ئیتر باسی ئەو هەموو چەرمەسەرەیە ناکەم کـە بـە هۆی تۆوە بە سەرمدا هاتووە. هەموویان بوونەتە لافاوێك لە رق و نەفرەت. دڵی من بەرگەیان ناگرێت!

ـ کچم! هەموو ئەوانە بە هۆی نەزانی و نەخوێندەواریـەوە بـووە. ئەگـەر فـامم هەبوایـە بەوجۆرەم نەدەکرد. خانم دوکتور! من وامدەزانی کە ئەگەر کچەکەم ببێتـە بـووکی ماڵـەخان، خوشبەخت دەبێت. کاتێك دەمبیست کە دەیـان وت: کچـی فـەرەج بـووکی خانـە! گەشـکەم دەکرد. قەد بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ژیانی کچەکەم لە چە دۆخێکدایە. ئاخۆ بۆ خۆشی رازیە، یان نا؟!

یان بیرم نەدەکردوە کە بۆچی دەبێ ئیجازە بدەم ژنەکەم بکەوێتە گیانی ئەو منداڵە پـاك و بێ دایکە؟ راستە، تەنانەت رۆژێکیش لـە سـەیرانم نەپرسـیوە، وەزعـی چـۆنە! ژیـانی چـۆن دەگوزەرێت! یان چ گیروگرفتێکی هەیە؟ من ئەوم شکاندبوو، بۆشم گرنگ نەبوو.

پاش ئەو وتانە، باوکی سەیران لە ژوورەکە وەدەرکەوت. دوایین وتەی ئەوە بوو کە من وەك خوشکێکی دڵسۆز ئاگاداری سەیران بم. برێك پارەشی دانا تا بیدەم بە سەیران. بەڵام پارەکـەم لێ وەرنەگرت. ئەوشەوە خەوم لێ‌زڕا. نیوەشەو، چوومە دەرێ. سەیرانم دی کە پاڵی بە درەختی توەکەوە دابوو و هۆن هۆن دەگریا. درەختەکە لە تاو سـەرما، وشـك ببـوو و بـەفرێکی زۆری لەسەر نیشتبوو. دەستی سەیرانم گوشی و دەستم کردە ملی. هەوا زۆر سارد بوو. بـەفر ئـارام ئارام دەباری. بەڵام هەستم کرد کـە دڵـی سـەیران زۆر گەرمـە و پـڕ لـە هەسـت و ئەوینـە. نیگاکانی پڕ مانا و چاوەکانی پڕ لە فرمێسك و دڵی ببوە هێلانـەی خـەمێکی قـورس. ئـەو توانیبووی واز لە رابردوو بهێنێ، بەڵام زۆر بە تاسەی کاوە بوو. لەو کاتەوە هاتبووە لای ئێمە، تەواو بووژابووژابۆوە. مەنیژە چووبووە ژوورێکیتر و تەختەکەی خۆی بە سەیران دابوو.

رۆژێك مەنیژە ئاگاداری کردینەوە کە گەرەکیـە بگەڕێتـەوە بـۆ شـارەکەی خـۆی. مـن و سەیرانیشی بۆ زەماوەندەکەی بانگهێشت کرد.

لە مەنیژەم پرسی کە ئاخۆ بڕیاری سەرەکی خۆی داوە یان نا؟ ئەویش وتی:
ـ یەلدا، سەبارەت بە ڕێنوێنییەکانت زۆرم بیر کردەوە. ئاخرەکەی هاتمە سەر ئەو قەناعەتە کە ئەکبەر کوڕێکی باشە و دەتوانیٚ خۆشبەختم بکات. ئەو بڕیارەی مەنیژەم پیٚ باش بوو. بە تایبەت کە مەنیژە توانیبووی باوەڕی بە خۆی و بڕیارەکانی هەبێت.

سەیران لە دۆخێکدا نەبوو بچێتە سەر شایی و زەماوەند من باش لێی تێگەیشتبووم کردبوو. هەرچەند زەمەن بە پەلە ئەگوزەرا، بەلاّم نەیئەتوانی بە یەك جاری بیرەوەرییە تالّەکانی رابردووی سەیران بسڕێتەوە. دلّتەنگیەکانی ئەو کاریگەرییان لەسەر منیش دانابوو.

ڕۆژێك خەریکی کتێب خوێندنەوە بووم. سەیرانیش خەریك بوو سەیری رەسمەکانی نێو ئالبۆمەکەی منی دەکرد. چاوی بە رەسمی کچێك کەوت کە هاوتەمەنی خۆی و جوانیش بوو. لێی پرسیم: یەلدا، ئەو رەسمە هی کێیە؟

وتم: ئەو هی کچێکی خالّۆزامە. ناوی شیوایە.

لێم پرسی: هەر بەراست سەیران بیٚ تاقەتیان نەبووگی؟

ـ نازانم. هیچ هەستم بۆیان نییە. ئەوان مندالّی من نەبوون. هەرچەند خۆشم دەویستن و کەمیشم بۆیان نەکرد. بەلاّم ئەوان زیاتر هۆگری دایەگەورەیان بوون و ئاوڕێکیان لە من نەدەدایەوە.ـ

ـ سەیران! ئەگەر پێت خۆشە، تەلەفۆنیان بۆ بکە، بگرە کەمێك هێور ببیتەوە.

ـ نا یەلدا. پێویست ناکات. من چیم لەوانە داوە.ئەوانیش هەر وەك من قوربانین. بەلاّم بە شێوازێکی دیکە. وازیان لیٚ بێنە با چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن. راستە کە لێیان دوورم، بەلاّم لە ناخم دان.

ـ ئەریٚ سەیران، ئەی کاوە؟ ئێمە دەتوانین بە یاریدەی یەکتر کاوە بدۆزینەوە. کیٚ دەلّیٚ هێشتا ژنی هێنابیٚ!

ـ دلّنیا نیم. پێموایە تا ئێستا زەماوەندی کردوە.

ـ ئەی مەگەر بەلّێنی پیٚ نەدابووی ژن نەهێنیٚ؟

ـ راستە. بەلاّم ئەو دەردەی من بەوم دا باوەڕ ناکەم جارێکی دیکە بگەڕێتەوە لام. چووزانم، گاهەس هێشتا تۆزقالّێك خۆشەویستی لە ناخیدا مابیت؟ خودا بە دلّی تۆ بکات!

زەمەن هەروا رادەبوورد و خەمۆکی سەیران تەشەنەی ئەکرد. بە بێدەنگی راهاتبوو. من دەمویست بیخەمە سەر رەوتی ژیانێکی هەنووکەیی، بەلاّم ئەو لە رابردوودا دەژیا و پالّی بە

بیرەوەریەكانییەوە دابوو و ئاوڕی لە داهاتوو نەدەدایەوە. تا ئەوەی كە رۆژێك دایكم تەلـەفۆنی بۆ كردم كە لەگەڵ باوكم و براكەم دەیانەوێ سەردانم بكەن تا هـەم لـە وەزعـم ئاگـادار بـن و هەمیش سەفەرێكی ئەو ناوچەیە بكەن. زۆرم پێ‌خۆش بوو و پتر هانمدان تا لەم ناوچە شاخاویە دیدەن بكەن. ئاخرەكەی بڕیاریان دا رۆژی شەممە بكەونە رێ. لەگـەڵ سـەیران كەوتینـە خـۆ و خۆمان ئامادەی میوانداری كرد. رۆژی یەك شەممە گەییشتن. بە ئۆتۆمبێلی براكـەم هـاتبوون. هەر كە ماشێنەكەی سیرووسم دی كە لـە دەم دەرگاكـەدا راگیرابـوو راچڵەكیم. خۆشـیان لـە بنەماڵەكەم لاڵ ببووم. هەموو وشەكان لەبەر چاومدا ریزیان بەستبوو،بەڵام توانـای دەربـڕینی هەستەكانم نەبوو. دەمێك بوو نەمدیبوون. سەیرانم بە بنەماڵەكەم ناسـاند. ئـەوان بـەدیـتنی سەیرانی هاوەڵی زۆر جوانم، كەجل و بەرگەكەی هێندەی‌دی جوانیان كردبوو، خوشـحاڵ بـوون. سەیران چێشتێكی خۆشی بۆ لێ دەنان و بە جۆرێك میوانـداری لـێ دەكـردن كـە هەسـت بـە غەریبی نەكەن. ئەو رەفتارەی سەیران بەلایانەوە جێگـای سـەرنج بـوو، بـە تایبـەت كـە زۆر لەسەرخۆ و ماقووڵانە دەجووڵایەوە. ئەوان بەو هەموو كەمال و جەمالەی سەیران، ئافـەرینیان دەوت و شانازیان پێوە دەكردم كە توانیومـە دۆسـتێكی وەهـا بدۆزمەوە.براكەشـم، كـوڕێكی لەسەرخۆ و ئارام بوو. ئەو خاوەن پلەی سەربازی بوو. هەرچەند نەیدەتوانی زۆر سەفەر بكات، بەڵام چونكە ماوەیەك بوو یەكترمان نەدیبوو، هاتبووە سەردانم.

ئەو ماوەیە كە لامان بوون، شەوانە، بۆ نووسـتن پیاوەكـان دەچـوونە ژوورەكـەی ئاغـەی ئـەمیریان و ئێمـەی ژنگـەلیش لـە ژوورەكـەی خۆمانـدا دەمایـنـەوە. شـەوێك، خـەریكی گەڕاندنەوەی بیرەوەرییەكانی سەردەمی منداڵی مـن و براكـەم بـووین و بـاوك و دایكـم قاقـا پێدەكەنین، زانیم كە سەیران كپی كردوە و لۆژ دایبردوە.

دایكم پرسی: سەیران، چییە؟ بۆ ئەوەنـدە لـەناو خـۆت دای؟ خـەمخواردن كارێـك ئاسـان ناكات، تۆ ئەبێ بۆ داهاتوو بڕوانی! ئەو زیندانە چییە بـۆ خۆتـت سـازاندوە؟ رابـردوو ئیـدی ناگەڕێتەوە.یەلدا باسی هەموو شتێكی بۆ كردووم، تۆ دەبێ خۆڕاگر بیت كچم! دەبێ رابردووی خۆت لە گۆشەیەكی ئەو كوێستانەدا لە گۆڕ بنێیت و بیر لە داهاتوویـەكی بـاش بكەیتـەوە. هیوادارم هەموو ئەوانەی كە خراپەیان دەرهەق كردووی، گـەردنیان ئـازا بكـەیت تـا بتـوانی دەروونی خـۆت هێـور بكەیتـەوە. مـن ئـەوەت وەك دایكێـك پـێ ئێـژم. لێبـوردن كـارێكی گەورەیە،بەڵام ئاسان نییە. هیوادارم تۆ ئەو كارەت پێ بكرێت تا بتوانی هێور ببیتەوە.

باوكیشم هاتە قسە و وتی:

ـ کچە خۆشەویستەکەم! تۆش وەك سەیرانی. باسی سەروەت و سامانی خۆم ناکەم، بەڵام بڕیار دەدەم ژیانێکی باشت بۆ دابین بکەم. تۆ دەتوانی پاش ئەوەی یەلدا، لێرە وادەکەی تەواو بوو، لەگەڵی بێیتە لامان. هەموو شتێکت بۆ دەکەم. تۆش بەقەد کچەکەم ڕێزت هەیە و من بە پاڵپشتی خۆت بزانە.

براکەشم کە هەروا بێدەنگ گوێی ڕاگرتبوو، وتی: سەیران خانم! باشترە بێیە لامان. منیش چیم پێبکرێت درێغی ناکەم. دڵنیا بە.

سەیران وتی: ئاغەی کەریمی! لە بەزەیی و گەورەیی ئێوە و بنەماڵەکەتان سوپاس دەکەم. من شوێنێك شك نابەم. یا دەبێ لای یەلدا بم، یان لای مینا. سوپاستان دەکەم کە بۆ من بە پەرۆشن. خۆزگا بەشێکی کەمی ئەو ڕوحم و بەزەییەم بە باوکمەوە بدیبایە.

وردە وردە پێوەندی بنەماڵەکەم لەگەڵ سەیران قووڵتر دەبوو. ئێمە پێکەوە دەچووینە شوێنە دڵڕفێنەکانی هەورامان و کەیفمان دەکرد. دایکم ژیانی ئەو ناوچە شاخاوییەی بەلاوە پەسەند بوو. حەزی دەکرد لام بمێنێتەوە. بەتایبەت کەیفی بە مزگەوت و تەکییەکانی هاتبوو. بنەماڵەکەم بە دیتنی ئەم شوێنە هەستێکی دیکەیان لا گەشابوویەوە. باوك و دایکم لە ناو هاوتەمەنەکانی خۆیاندا دۆست و هاوەدەمی باشیان دۆزیبوویەوە. ئەوان هێندە لە ئاووهەوای دووکەڵاویی تاران بێزار بوون کە بە ئاووهەوای ئێرە تەواو بووژابوونەوە. وردە وردە پشووی براکەم تەواو دەبوو و ئەوان دەبوا بگەڕێنەوە. مەنیژەش تازە لە مارەبڕینەکەی گەڕابووەوە.

ئەوان، بە دیتنی دۆخەکە خەیاڵیان سەبارەت بە من ئاسوودە بوو. بە تایبەت کە زانیان لەناو چە خەڵکانێکی بێ خەشدا ئەوان کە ئاوا دیتیانم ئیتر لێم دڵنیابوون و خەمیان نەما بە تایبەتی کە زانیان لەنێو خەڵکێکی بێ فرت و فێڵ دادەژیم.

کە سواری ماشێنەکە بوون، سیرووسی برام وتی: یەلدا، بڕوا بکە ئەگەر کاوەی هاوکارم لێرە بوایە، من جارێ دەمامەوە. بەڵام دەزانم ئەو هێشتا نەگەڕاوەتەوە سەر کار.

بە سەرسووڕمانەوە پرسیم: سیروس کاوە کێیە؟

ـ بۆچی نایناسی یەلدا؟ کاوەی هاوکارم! ملازم ئەفشار!

ـ نایناسم. بەڵام حەز دەکەم بزانم ئەو کاوەیە خەڵکی کوێیە؟

ـ خەڵکی کرماشانە.

ـ سیروس گیان، تاوێ ڕاوەستە! ئیشێکم پێتە!

ـ وەستام تا سەیران هات. لێم پرسی: کاوە خەڵکی کوێ بوو؟

ـ کرماشان!

ـ ئەی چۆن دەتگوت بە هەورامی دەدوێت؟

ـ باوکی هەورامییە و دایکی کرماشانی. ئەو لە کرماشان گەورە بووە.

ـ راستی ، ناوی باوکی چییە؟

ـ سەردارخان!

کاوە ! تکایە بزانە ئەمە هەمان کاوەیە کە سەیران باسی دەکات؟

ـ یەلدا! من جارێ لە تارانم! سەردەرناکەم! باسی چی دەکەن؟

ـ جارێ واز بێنە. دواتر بۆتی باس دەکەم. کەوای لێهات، منیش ئیجازە وەردەگرم و لەگەڵ سەیران دێینە تاران. دەڵێی ونبوویەکمان دۆزیوەتەوە!

من و سەیرانیش خۆمان ئامادە کرد و لەگەڵ ئەوان بەرێ کەوتین. دووریی نێوان هەورامان و تاران، وای کردبوو کە ئەو ماوەیە لە هەورامان بووم، نەتوانم بگەڕێمەوە تاران، بەڵام هەنووکە وەزعەکە فەرقی دەکرد. بگرە بتوانین لەگەڵ سەیراندا کاوە بدۆزینەوە. هەمووومان بەو سەفەرە خوشحاڵ بووین. بە تایبەت سەرنجی ئەو دزەنیگایانەم دەدا کە براکەم لە ئاوێنەکەوە لە سەیرانی دەگرت. بەڵام سەیران ئاوڕی لێ نەدەدایەوە. ئەو بە ویستی خۆی جل و بەرگی کوردی لەبەر کردبوو. حەزی لە جل و بەرگی فارسی نەبوو. دەیگوت: بە جل و بەرگی خۆیانەوە رەحەتە، هەرچەند دەمزانی کەمێك نامۆیی دەکات.

سەیران وەك هەمیشە لە جوانیدا پرشنگی دەدایەوە. جوانییەکەی سەرنجی هەر کەسێکی بۆ لای خۆی رادەکێشا. تەنانەت ئەو خەڵکەش کە لەو ئۆتومبیلانەدا بوون کە بەلاماندا رائەبوورین، ئاوڕیان لێ دەدایەوەو سیرووس لە داخان ئاگری دەگرت. ئەوەم باش دەخوێندەوە. بەڵام سەیران بەردەوام لە ناوخۆیدا بوو و هەستی بە غەریبی و کەمێکیش شەرم دەکرد. باوك و دایکیشم، یان سەیری دیمەنە جوانەکانیان دەکرد، یان باسی هەورامان و خەڵکەکەیان دەگێڕایەوە.

سیرووس، وەك بڵێی شکی بۆ شتێك چووبێت، لەسەر بابەتەکەی کاوە دەچوو.

ـ سەیران خانم! ئەرێ، ئەو داستانە چییە کە یەلدا سەبارەت بە کاوە گێڕایەوە، حەز دەکەم لە دەمی خۆتەوە بیبیسم، راستە؟!

ـ کاکە سیرووس! ئەو ناسیاوی ماڵە خەزوورانم بوو. بەڵام چاکەی زۆری لەگەڵ کردووم، بە دەس ئەو پلانەوە نەجاتی دام کە بۆیان داڕشتبووم. بەتایبەت لە لایەن خەسووم و سەیوانی شوومەوە.

لەم کاتەدا دایکم بە پێکەنینەوە پرسی:

ـ ئەی بۆچی یەلدا دەیوت" تۆ ئاشقی کاوە بووی؟

ـ مەستوورە خانم، من هەرگیز درۆم نەکردوە و درۆزنیش نیم. من ئاشقی هەڵسوکەوتی جوامێرانەی ئەو ببووم. هی ئەو هەموو پیاوەتیە کە سەبارەت بە من دەیکرد، نەك ئاشقی قەد و قیافەی! بە باوەڕی من، ئەوە ڕێز و حۆرمەتە بەرانبەر بە کردارە جوامێرانەکانی.

سیرووس بزەیەکی کرد و پیشی خواردەوە. من هەستم بەوە کردبوو کە سیرووس ئاشقی سەیران بووە. بەڵام نەیدەدرکاند. لەو کاتەوە کە هاتبوونە هەورامان، ئاگام لە هەڵسوکەوتەکانی بوو. دەمزانی کە سات بە سات زیاتر هۆگری دەبێت. بەسەزوان هەقیشی بوو. کێ ئاشقی سەیران نەدەبوو. ئەو ماوەیە کە سەیران لە ماڵی ئێمە مایەوە لەگەڵماندا ڕاهاتبوو. جاروبار دەمان بردە دەرەوە. بە تایبەت بۆ پارکەکان. تا بتوانین لە ڕابردووی دابیبڕین.

هەستم دەکرد سەیران جاربەجار باشتر دەبێت. چەند جارێك بردمە لای ڕاوێژکار و ئەوکارەشم بووە هۆی خوشحالّی بنەماڵەکەم.

ڕۆژێك بە سیرووسم وت کە گەرەکمە لەگەڵ کاوەدا قسە بکەم. بەڵام کاوە لە ژێری دەردەچوو.

وتی: بۆ چی تێناگەی؟ مەگەر سەیران نەیوت ئیدی پێویست ناکات لەگەڵیدا قسە بکەین! زیاد لەوەش! ئەو ئێستاکە بە شوێن کاردا چووە. هەرکە گەڕایەوە، بۆ خۆم داوەتی دەکەم. ئەوکات هەتا حەز دەکەی قسەی لەگەڵ بکە.

ـ ئەرێ سیرووس! تۆ بزانی کاوە ژنی هێناوە؟

ـ نازانم. تا ئێستا لێم نەپرسیوە. ئەگەر ڕاستیت دەوێ، ئەوەندە یەکتری نابینین، تەنیا ڕۆژانی هەینی دەتوانین چاومان بە یەك بکەوێت.

ـ کەواتە ماتڵ ئەبم تا بگەڕێتەوە. با ئەوەش بە سەیران بڵێم.

ڕۆژێك سیرووس تەلەفۆنی کرد و وتی کاوە گەڕاوەتەوە و بۆ نانی شێو داوەتی کردوە. داوای کرد تا خواردنێکی باش ئامادە بکەین. منیش ئەو هەواڵەم بە سەیران دا و ئەویش

زۆری پێخوش بوو، بەڵام نەیدرکاند. ئێمە کەوتینە چێشت لێنان. سەعات شەشی ئێـوارە بـوو کە کاوە و سیرووس هاتن. سیرووس سەبارەت بە سەیران، شتێکی بە کاوە نەوتبوو. سەیران لە ژوورێکدا لەسەر موبلێك دانیشتبوو. چوومە لای و داوام لێکرد تا بێت و بـەخێرهاتنی کـاوە بکات. سەرەتا نەدەهات. شڵەژابوو. لێیان گەڕێ با تەنیا بـن. بـەڵام مـن پێـداگریم کـرد و ئەویش قەبووڵی کرد. سەرەتا من چوومە لایان. سیرووس منی پـێ ناسـاند. کـوڕێکی خـۆش پێکەوتوو بوو. پاشان سەیران هات. کاوە لەبەری هەستایە سەرپێ. وشـك بـوو. بـەڵام خێـرا کەوتەوە خۆی. سەیرێکی سیروسی کـرد، پاشـان چـاوی بڕیـە سـەیران. سـەیرانیش بـەردەوام بێدەنگ بۆ ئەوی دەڕوانی.

ـ سلاّو کاوە!

ـ سلاّو سەیران گیان، تۆ لە کوێ و ئێرە لە کوێ!

ـ میوانی دوکتور یەلدام. ئەو دۆستی گیانیبەگیانی منە. دوکتوری هەورامانە.

ـ کەی هاتووی؟

ـ پێنج شەش رۆژێك دەبێت.

ـ چۆنت زانی من لێرەم؟

ـ سیرووس پێی وتم.

ـ ئەی سەیوانی شووت لە کوێیە؟

ـ دەمێکە جیا بووینەتەوە.

ـ بەراستتە؟

ـ ئەرێ.

ـ چۆن وەها بڕیارێکت دا؟

ـ گەییشتبووە گیانم. وەك بۆمبا تەقیمەوە.

ـ کارێکی باشت کردوە. ئەی بۆچی هەواڵێکی منت نەپرسیوە؟

ـ ئەی تۆ چی؟ بۆچی سەرێکی هەورامانت نەدا؟

ـ باشە کەسێك دوور بخرێتەوە، چۆن دەتوانێ بگەڕێتەوە؟

ـ من هەمیشە شەرمەزاری فیداکاریەکانی تۆم. دەزانم لەبەر من چیت دەکرد. من بوومـە هۆکاری ئەو هەموو دەردی سەرەی کە بەسەرتدا هات! تۆخوا ئێسـتە چـۆنی؟! لـە کارەکـەت رازیت؟

ـ ئەرێ. بۆچی نا!

لەپڕ سیرووس هاتە ناو قسەکانیان و بە شڵەژاوییەوە پرسی: هەر بەراست تۆ سەڵتی یان خێزانداری؟

ـ کاوە بەسەرسوورمانەوە وتی: سیرووس، ئەوە چەند ساڵە ئەو پرسیارەت لێ نەکردووم! ئێستا چی قەوماوە؟

ـ هیچ. هەروا. حەزم دەکرد بزانم.

ـ کاوە وتی: ئەگەر بێژم نا، درۆ دەکەم.

لە پڕ سەیران سەیری کاوەی کرد و وتی: مەبارەك بێت! ئەی بۆچی ئێمەت بۆ زەماوەندەکەت داوەت نەکرد؟!

ـ جارێ دەسگیراندارم.

ـ لە ژێر چاوەوە سەیری سیرووسم دەکرد. بزەیەك زایە سەر لێوانی. بەڵام سەیران زۆر زویر نەبوو. پرسی: باشە، دەسگیرانەکەت خەڵکی تارانە؟

ـ ئەرێ. خوێندکارە.

ـ مەبارەك بێت. هیوادارم پێکەوە پیر بن و لە سێبەری یەکدا بحەسێنەوە.

سیرووس ئەو هەوایەی بەدڵ بوو. دەتگوت دیلێکە و لە زنجیر ئازاد بووە.

کاوە، رووی کردە دایکم و وتی: مەستوورە خانم، ئێوە کەی دێنە ماڵی من؟

دایکم وتی: دوای زەماوەندەکەت!

کاوە رووی دەمی کردە من و وتی: یەلدا خانم! دیارە دەبێ تۆش بۆ زەماوەندەکەم بێت و سەیرانیشتان لە بیر نەچێت.

بەدزی سەیرانەوە ، کاوە، لێی پرسیم" یەلدا خانم، خۆ لە ژیانی سەیران ئاگاداریت؟

ـ ئێی. تا رادەیەك.

ـ ئازارەکانی سەیران لە چاوانی کاوەدا پەنگیان خواردبووەوە. بەڕوونی هەستم بەوە دەکرد.

پێم وت: کاوە، ئەگەر دەرفەت هەبێ دەمەوێ کەمیك لەگەڵت بدوێم.

ـ فەرموو. لە خزمەت دام.

ـ لەو کاتەدا سیرووسیش وتی" لەسەر ئیزنتان، من بە تەنیا جێتان دەهێڵم. دایکیشم بە شوێن ئەودا چوو.

ـ فەرموون خانم دوکتور، من لە خزمەت دام!

ـ کاوە! سەبارەت بە تۆ، سەیران هەموو باسێکی بۆ کردووم. بە هەموو شتێك دەزانم.
ـ ئەی باسی ئەو رەفتارەشی کرد کە لە گەڵمدا کردی؟!
ـ ئەریٚ. ئەوەشی وت.
ـ راستە یەلدا. ئەو داوەی بۆیان تەنیبوو، زۆر نیگەرانی دەکردم. نەمدەویست بە بیٚ هیچ تاوانێك لە دار بدرێت. زۆرم هەوڵ دا تا بەرپرسەکان لەو پیلانە ئاگادار بکەمەوە. بەڵام بنەماڵەی خان ناسراو و دەسڕۆشتوون. توانییان بە زەبری پارە ئابڕووی خۆیان بسێننەوە و هۆکاری مردنەکەی خان، وەك وەستانی مێشك لەقەڵەم بدەن.
ـ کاوە، تۆ هەرگیز سەیرانت خۆش نەویستوە ؟!
ـ وا نییە. من ئاشقی ئەوم. هەرچەند لە بنەماڵەیەکی ناسراویش بوو، بەڵام داوام لێکرد تەڵاق وەربگرێت و شوو بە من بکات. کەچی ئەو، ئەو زیندانەی هەڵبژارد کە تێیدا بوو. ئەو باوەڕی بە خۆی نەمابوو. بەردەوام بێدەنگ دەبوو. دڵی منیشی شکاند و منیش بەنابەدڵی بەجێم هێشت. ئەگەر پێداگریی کەس و کارم نەبوایە، قەت ژنم نەدەهێنا. هەست دەکەم ئەشقی من و سەیران لە ئاسمانەکاندا خولڤاوە. ئەوا دووبارە بە بینینی ئەو، خەریکە سەرسەری دەبمەوە. لەو لاشەوە، نابیٚ گاڵتە بە ئەو کچەش بکەم. بۆیە چیتر مزاحمی ئێوە نابم. گلەیی لە سەیران بکە کە باش بە دەممەوە نەهات. هەرچەند لەوانەیە لەمەودوا ئەو نەفرەتی لە من زیاتربێت، بەڵام من تاهەتایە ئەوم خۆش دەوێت.
کاوە رۆیشت. منیش بە دوای سەیراندا دەگەڕام. دیم لەگەڵ سیرووس دانیشتوون و پێکەوە قسە دەکەن. سەرم لەو رەفتارەی سووڕما. لەلایان دانیشتم و چاوم بڕیە چاوەکانی. پێم وت: سەیران! کاوە چوو. ئەوە چ هەڵس و کەوتێك بوو کە لە گەڵت کرد.
ـ بۆچی چیم کردوە؟
ـ بیٚ مەلامات بووی. بۆت گرنگ نەبوو. کاوە گلەیی دەکرد.
(سەیران وای دەنواند کە هاتن و چوونی کاوەی بەلاوە گرنگ نەبووە. بەڵام من دەمزانی هەر خۆنواندنە.)
ـ مەگەر چەند کاتژمێرێك لە وەختمی نەگرت، ئیدی چی دەویست؟
ـ رووم کردە سیرووس و داوام لێکرد بۆ ماوەیەك بە تەنیامان جیٚ بێلێت.
ـ سیرووس بە پێکەنینەوە وتی“ بۆچی دەبیٚ هەمیشە من ئێوە بەتەنیا جیٚ بێڵم؟! ئەوەی وت و رۆیشت.

ـ گویّ بگرە سەیران! ئەو هەڵسوکەوتەت باش نەبوو. زۆر بێ مەلامەت بووی. ئەوەش بزانە کە ئەو رەفتارەت لە دڵتەوە نەدەهات. دەزانم لە بەر ئەوە وات کرد کە کاوە دەسگیرانی گرتبوو. باشە ئەو چووزانیّ تۆ تەڵاق وەردەگریت و دێیتە ئێرە؟!

ـ ئەزانی چییە یەلدا! من ئیتر هیچ هۆگریەکم بە کاوەوە نەماوە. ئەو دەسگیرانی هەیە. مافی خۆیەتی چۆن بژیت.

ـــ وانییە سەیران. تۆ زۆر تووڕەی. کاوە ئێستاش تۆی گەرەکە. دوور نییە لە دەسگیرانەکەی جیا ببێتەوە. پەلە مەکە!

ـ نا یەلدا! نامەویّ ببمە هۆی دڵشکانی کەس. گاڵتە بە هەستی کچێکیش ناکەم.

ـ تەنانەت بە نرخی دۆزینەوەی خۆشەویستیی و پێکەوەنانی ژیانێکی سەربەرزانەش؟

سەیران لەکاتێکدا کە چاوی لە درەختەکەی ئەولای حەوشەکە بڕیبوو، گوتی: من تازە فەوتاوم، درەختێکی وشكبووم. نابیّ پاڵ بە درەختێکی سەوزەوە بدەم. با ئەویش وەك خۆم وشك نەکەم.

ـ نا سەیران! تۆش کاتی خۆی سەوز بووی!

ـ یەلدا گیان، ئیتر پێم باش نییە لێرە بمێنمەوە. باشتر وایە بگەڕێمەوە هەورامان بۆ لای باوکم . بەشکەم بە کەسێکی باشتر لە سەیوانم بفرۆشێت. نامەویّ ژیانی کاوەش ئاڵۆز بکەم. ئەو شایەنی هاوسەرێکی باشتر لە منە.

ـ وانییە سەیران! کارەکانت هەموو لەبەر خاتری کاوە بوون. تەڵاق وەرگرتنەکەت، هاتنت بۆ ئێرە. تۆ خەریکە بۆ ئەو خۆت فیدا دەکەی. باشە بۆچی رووبەڕووی ناوەستیت و هەموو ئەوانەی پیّ ناڵێی؟ ئەو هێشتا دەسگیرانەکەی مارە نەبڕیوە. درەنگ نییە سەیران! غیرەتت هەبیّ!

ـ نا. باوەڕ بکە غیرەتی ئەوەم نییە!

ـ تۆ غیرەتی هیچ کارێکت نییە. تۆ خۆتت خۆش ناوێت. تەنیا بۆ خەڵکی تردەژیت. کەسانی وەك تۆ دەبیّ دایم بەشیان بەزین و شکست بێت.

لەم کاتەدا سیرووس هاتە ژوورەوە و وتی:

ـ یەلدا! واز بێنە. ئیتر لەسەری مەڕۆ. من هەر لێرە خوازبێنی لە سەیران دەکەم. کاوە دەسگیراندارە. بەڵێن بێت سەیران بەختەوەر بکەم.

سەرسام بووم. سەیرانیش چاوەڕوانی دۆخێکی وەهای نەدەکرد. گوتی:

ـ ئاغه سیرووس، ئەوەت لە دڵەوە گوت، یان گاڵتەت کرد؟!

ـ نا سەیران! گاڵتەی چی؟ لەو ڕۆژەوە تۆم دیوە ئارامم لێبڕاوە. چیتر توانام نەماوە. خۆم پێ ڕاناگیرێ. هەر ئێستا بە بەرچاوی یەلداوە خوازبێنیت لێ دەکەم. ئەو ڕاستیەم بە باوکیشم وتوە!

وەی خوایە گیان! بڕیارەکەی سیرووس ژیرانە نەبوو. ئەو شێت ببوو. دەیویست گرەوەکە لە کاوە بباتەوە. نەمدەزانی دەبێ چی بکەم. چووزانم جاری وابوو ئێرەییم بە سەیران دەبرد کە چۆن ئەوەندە داواکاری زۆرە! تەنانەت براکەی منیش کە عەنعەنە و تەنتەنەیەکی هەیە و هەموو کچانی ناسراو و خزم، بۆی بەداخن، ئێستە ئەویش ئاشقی سەیران بووە. کاوەش پێی خوشە دەس لە دەسگیرانە تارانییەکەی هەڵبگرێت و بگەڕێتەوە بۆ لای سەیران. بۆم نەدەچۆوە سەریەك؟

سەیران خۆی گەیاندە دایکم و وتی: مەستوورە خانم! سیرووس بە لای ئێوەوە باسی چی کردوە!؟

دایکیشم ئەوی ماچ کرد و وتی: ئازیزم! باسی هیچی نەکردووە تۆ بخوازێت! خۆ ئەوە شتێکی خراپ نییە؟

سەیران خێرا وتی: تۆ بۆچی ئیجازە دەدەی کوڕەکەت کچێکی لادێیی و نەخوێندەوار بخوازێت؟!

ـ نە کچم تۆ لە هەڵە دای! من حەز دەکەم کوڕەکەم کەسێك بخوازێت کە ئاشقی بێت و بتوانێ بۆخۆی لەگەڵیدا بەختەوەر بژێت و، نەك ئەوەی خەڵك پێیان وابێ بەختەوەرەو هیچی دیکە. نامەوێ بکەوێتە دۆزەخێکەوە کە دواتر مەودای دەرچوونی نەبێت. من هیچ سەرپێچییەکم سەبارەت بە هاوسەری ئێوە نییە. باوکیشی هەروایە. تۆش نابێ ئەوەندەخۆت بە کەم بگریت. من ئەوە یەکەمجارە ژنێك دەبینم هێندەی تۆ جوان بێت.

سەیران، لایەکی بەلای مندا کردەوە و پرسی: ڕای تۆ چییە ؟یەلدا!

ـ سەبارەت بە چی؟

ـ داخوازی براکەت!

ـ خۆت سەرپشکی و دەتوانی بە ویستی خۆت بڕیار بدەیت. بەڵام مەکەوە شوێن هەستەکانت. هەوڵ بدە پرسێکیش بە دڵت بکەیت. بڕیارێك بدە کە لێی پاشگەز نەبیتەوە.

ده ڕۆژێك دەبوو سەیران لە ماڵی ئێمە بوو. بردبوومە لای پسـپۆڕی دەروونناسـی. گـوتی تووشی خەمۆکییەکی توند بووەتەوە، بەڵام خەریکە وردە وردە بەرەو باشی دەڕوات.

ڕۆژێك، پاش ئەوەی بردمەوە لای ڕاوێژکار، پێکەوە چووینە پارك. ئەو ڕۆژە بردمـە چـەند پارکێکی تاران. بەلایەوە زۆر جوان بوون. تۆزێك دڵی خۆش ببوو.

ڕۆژێك سیرووس لە سەرکار گەڕایەوە و وتی: کاوە هەمووومانی بۆ نانی شێو داوەت کردوە.

سەرەتا سەیران نەدەهات، بەڵام توانیمـان ڕازی بکـەین. سـەیران خـۆی ڕازانـدبووە. ئـەو جلانەی لەبەر کرد کە من بە بۆم سەندبوو. زۆر لێی دەکاڵانەوە. هەرچیم کرد کە جل و بەرگی فارسی بکاتە بەر، قەبووڵی نەکرد. ئەو ڕۆژە باوکم لە ماڵەوە نەبوو. بۆیە کە چـووینە مـاڵی کاوە، ئەومان لەگەڵ نەبوو. کاوە، بـە بینینمـان زۆر خوشـحاڵ بـوو. بینـینی سـەیران زیـاتر خوشحاڵی کرد. میوانداریيەکی باشی لێکردین.

سەیران پرسی: کاوە! چۆن توانیوتە خۆت وەها خواردنێك ئامادە بکەیت؟

ـ بڕیارم داوە هەمیشە بۆخۆم چێشت لێ نێم.

ـ ئەی باشە دەسگیرانەکەت کوا؟ ناتەوی پێمی بناسێنی؟

ـ من تەنیا داوام کردوە، کێ ئیژێ مارەم بڕیوە؟

پاش خواردنی نانی شێو، سەیران، خۆی بە سەیرکردنی ڕەسمی نێـو ئالبۆمەکـەوە خـەریك کرد. ئەو رقی زۆری لە دڵا بوو. نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت.

کاوە، ئیجازەی لێگرتین تا بۆ چەند کاتێك لەگەڵ سەیراندا قسە بکەن.

ـ گوێ بگرە سەیران! نابێ هەڵسوکەوتی منداڵانە بکەیت و لای میوانەکان من بشکێنیت. من هێشتا ژنم مارە نەبڕیوە. تەنیا قسەیەکمان کردوە. بە بینینی تۆ لەو قسـەیەش پاشـگەز دەبمەوە. ئەگەر بتەوێ، دەتخوازم.

ـ تۆش گوێ بگرە کاوە! تازە ژیانی من وێران بووە. تەڵاقم وەرگرتـوە. نـاڵێم لەبـەر تـۆ، لەبەر ئەو ستەمەی سەیوان لێی دەکردم. با هەرکاممان ڕێگای خۆمان هەڵبژێرین.

ـ چۆنی پێت خۆشە. بەڵام لە هەڵەدای. من ئامادەم بگەڕێمەوە لات. تەنیا دەبێ دەرفـەتم پێ بدەی.

ـ نا، کاوە! من ئارەزووم خۆشبەختی تۆ و دەسگیرانەکەتە. منـیش بڕیـارم داوە شـوو بـە سیرووس بکەم. ئەو خوازبێنی لێ کردووم. گەرەکم بوو لەو کارە، ئاگادارت بکەمەوە.

ـ وازبێنە سەیران! بۆچی دەتەوێ ئازارم بدەی؟ هەرگیز ناهێڵم ئەو کارە بکەیت. تۆ هی منی، نەك سیرووس!

دەنگی کاوە بەرز بوویەوە. دیاربوو تووڕە ببوو. بۆیە سەیرانی بە جێ هێشت و رۆیشتە دەرەوە.

چەند رۆژێك بوو سیرووس چاوەڕوانی وەڵامدانەوەی سەیران بوو. بەڵام سەیران، دایم لەخۆیدا بوو. خەریك بوو وەك دۆخی جارانی لێ دەهاتەوە و خەمۆکییەکەی سەری هەڵدەدایەوە.

رۆژێك سیرووس هاتەوە ماڵ و لێمی پرسی: ئاخۆ سەیران هیچی بە من نەگوتووە؟

منیش داوام کرد وازی لێ بێنێت. گوتم ئەو ئافرەتە داماوەتان شێت کردوە. زۆر ناڕەحەتە و گەرەکیە ئێرە بە جێ بێلێ.

وتی: بۆچی؟ مەگەر کارێکی خرامان لەگەڵ کردوە؟

وتم: من چووزانم! باشترە لە خۆی بپرسی؟ ئەوەتا لەو ژوورەدایە و خەریکە خۆی ئامادە دەکات.

ـ سلاو سەیران! ئەوە چییە؟ دەتەوێ بگەڕێتەوە؟

ـ واباشترە. دەبێ بگەڕێمەوە ئاغە سیرووس!

ـــ تکایە سەیران!! باشتر ئەوەیە بێدەنگییەکەت بشکێنیت و قسەی دڵت بکەیت.

ـ نازانم چی بێژم، ئاغە سیرووس. تۆ چاکەت بۆ من زۆر بووە. هەرهەمووتان. بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە من ئاشقی تۆ ببم. ئەشق شتێکی دیکەیە. لە یەك نیگادا دەخولڤێت و هەروا ئاسان لە دڵ دەرناچێت. تێدەگەم کە تۆ ئاشقی من بووگی. ئەوەم لە یەلداش بیستوە. بەڵام من ناتوانم زوڵم لە تۆ بکەم و درۆت لەگەڵ بکەم. راستیەکەی من هاتوومەتە ئێرە تا کاوە ببینم. ئێستاش کە دۆزیومەتەوە و زانیومە ئەو درۆزنە! ئەوەتا دەگەڕێمەوە. چونکە من لەم دونیایەدا تەنیا ئاشقی کاوەم. تەنیا ئەوم خۆش دەوێت. بەڵام کە دەزانم ئەو دەسگیرانی هەیە و گەرەکیە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا زەماوەند بکات، ئیدی من وازی لێ دێنم و دەگەڕێمەوە. باشترە منیش بگەڕێمەوە لای باوکم.

ـ کەواتە بێجگە لە کاوە دڵ بە کەسێکی تر نادەیت؟

ـ راستە. هەروایە.

ـ ئاخر سەیران! ئەوە بزانە کە من لە دڵەوە تۆم دەوێت، بەڵام کە دەزانم تۆ ئاشقی کاوەیت و درۆت لەگەڵ من نەکردوە، سوپاست دەکەم. تۆ دەتتوانی لە رقی کاوە شوو بە من بکـەیت، بەڵام دیارە تۆ زۆر بێ فرت و فێڵی. ئەمەش دەبێتە هۆ تا رێزت لای من زیاتر بێت. بەڕاستی کە خانمێکی هەڵکەوتە و خاوەن هەست و زۆریش جوانی. هیوادارم لە ژیانتا سەرکەوتوو بیت.

دایکیشم ماچی کرد و زۆر پەسنی کرد کە نەیویستوە گاڵتە بـە سـیرووس بکـات. لەبـەر ئەوەی باوکم لە ماڵ نەبوو، سەیران، داوای لە دایکم کرد تا لە بری ئەو سوپاس و ماڵاوایی لە باوکم بکات.

پاش دوو رۆژ گەیشتینەوە هەورامان. سەیران بە بینینی هەورامان زۆر شادمان بوو. بۆیە پێی وتم:

ـ یەلدا! ئێرە جوانترین و دڵخوازترین شوێنی ئێرانە. پێمخۆشە هەر لێرە، لە پاڵی ئەم بەفر و شاخانەدا بمرم. هەرچەند بێجگە لە تاڵە و سۆڵە، بیرەوەرییەکی دیکەم لێرە نییە، بەڵام ئێـرە زێدی منە. دەمەوێ لەبن پاڵی ئەو خاکە و ئەو گوڵە چنوور و شەوبۆیانەدا بنێژرێم.

بە بیستنی ئەو قسانەی سەیران، چاوەکانم پڕ فرمێسك بوون. ئەو دیمەنە هەست بزوێنانەم بەلاوە زۆر جوان و گرانیش بوون. من و سەیران ژیانی ئاسایی خۆمان دەس پێ کردەوە. من لە دەرمانگا کارم دەکرد و ئەویش بە دەم کارەکانی ناوماڵـەوە، خـەریکی دەرس خوێنـدن بـوو. ئەوەندە لە خوێندن سەرکەوتبوو کە دەیتوانی کتێـب بخوێنێتـەوە. جاروبـاریش سـەرێکی لـە باوکی دەدا. ئاگامان لەوە بوو کە سەیوانیش ژنێکی دیکەی هێناوە. بۆیە سـەیران وردە وردە رابردووی فەرامۆش دەکرد و ژیانێکی تازەی دەس پێدەکرد.

رۆژێك تەلەفۆنەکەمان لە خەوی پاش نیوەڕۆ خەبەری کردمەوە:

ـ بەڵێ!

ـ سڵاو یەلدا. منم کاوە.

ـ سڵام ئاغە کاوە، تۆ باشی؟

ـ خراپ نیم. کەش و هەوای ئەوێ چۆنە؟

ـ ئاساییە. ساردی کردوە. گەزێك بەفر لە زەوی دایە!

ـ راست دەکەی . دەزانم زستانی ئەوێ هەمیشە سارد و بەفراویە. ئەرێ سەیران خـەریکی چییە؟

ـ سڵاوی هەیە. ئێستا لێرە نییە. تۆ چی! زەماوەندت کرد؟

ـ با بگەمە ئەویٚ جا بە تیٚروتەسەلی بۆتی باس ئەکەم.

ـ تەشریف دیٚنی؟

ـ ئەریٚ خانم دوکتور. بڕیارم داوە حەوتەیەك ئیزن وەرگرم و بیٚمە ئەویٚ. خۆ بۆ شویٚنیٚك ناچی؟

ـ نا. ئیٚمە لە مالیٚن. چاوەڕوانین.

لەقسەکانی کاوە سەرم دەرنەچوو. تەنیا ماتلٚ بووم تا بگاتە لامان. ئەو بابەتەم بە سەیران وت، بەلاّم ئەو پیٚی ناخۆش بوو. ئەیگوت: بۆچی جوابم نەکردوە؟

بەلاّم داوام کرد تا فرسەتیٚکی پیٚبدات،بگرە بەخت رووی تیٚبکاتەوە.

رۆژی شەمە، سەعات دوی دوانیوەڕۆ بوو کە کاوە گەییشتە هەورامان و راستەوریٚ هاتە دەرمانگا. بە هاتنی ، زۆر خوشحالٚ بووم. داوەتم کرد بۆ ژوورەکەی خۆمان. سەیران بە سەر تەختەکەوە راکشابوو. بە بیستنی دەنگی کاوە، هەستایەوە و بەخیٚرهاتنی پیٚ وت و ئەوجا رۆشتە دەرەوە. بەو کارەی، کاوەی نارەحەت کرد. منیش دەسم کرد بە باسکردنی وەزعی دەرمانگا و نەخۆشەکان. تا ئەوەی گوتی: خانم دوکتور! تۆ دەزانی من بۆچی هاتوومەتە ئیٚرە؟

ـ ئاساییە! هاتووی سەردانی ناسیا و ئاشناکانت بکەیت!

ـ نەخیٚر وا نییە. هاتووم لەگەلٚ سەیران قسە بکەم.

ـ بۆچی لەگەلٚ سەیران قسەیەکتان بۆ کردن ماوە؟

ـ من هیٚشتا هیچم لەگەلٚی باس نەکردووە.

ـ راست دەکەی کاوە. تۆ دلٚی ئەوت شکاند. بە بەرچاوی هەموومانەوە باست لە دەسگیرانەکەت دەکرد. بۆچی ئەوە هەموو شتیٚك نابڕیٚتەوە؟

ـ نەخیر وانییە.

ـ بۆچی نا! ئەوە مانای هەموو شتە.

ـ ئەی بۆچی مەنحی سەیران ناکەیت؟ بۆچی ئەویش بڕیار نییە لەگەلٚ سیرووسی برات زەماوەند بکات؟

ـ گویٚ بگرە کاوە!

ـ تۆ گویٚ بگرن خانم دوکتور! هەموو شتیٚك دەزانم. بۆچی ئینکاری دەکەن. سەیران بۆخۆی ئەوەی پیٚ گوتم!

ـ وتی چی؟

ـ وتی سیرووس خوازبێنی لێکردوە و دەیەوێ شووی پێبکات.

ـ راستە سیرووس داوای کردوە، بەڵام خۆ سەیران ئەو خوازبێنییەی قەبووڵ نەکردوە!

ـ توخوا بەراست؟

ـ ئەرێ. سەیران لە تۆ زۆر باوەفاترە.

ـ نا دوکتور، خێرا سەرپشکیی مەکە. منیش سەیرانم خۆش دەویست.

ـ بەڵام ئێستا نەتگەرەکە!

ـ بۆچی نا. ئێستاش خۆشم دەوێ. ئەوە سەیرانە کە نایەوێ قسەم لەگەڵ بکات.

ـ خۆڕاگر بە. ئێوە خراپ لێك تێگەیشتوون. سەیران هەرگیز دڵی لە سیرووس نەچووە. ئەو تەنیا تۆی گەرەکە. ئاشقتە. داماوە، بۆ دۆزینەوەی تۆ عەودالّی شاران بوو.

ـ تکایە یەلدا خانم، بچۆ رازی بکە با پێکەوە قسە بکەین.

ـ لەو سۆزەی کە لە کاوەدا بەدی هاتبوو، وەختەبوو شاگەشکەبم. بۆیە خێرا بەدوای سەیراندا چووم. ئەو خزابووە ژوورەکەی ئەولاتر. هەر کە منی دی، روخساری گرژ کرد. چوومە لای. دەستێکم بە سەرکوڵمەکانیدا هێنا و گوتم:

ـ سەیران گیان لێم زویر مەبە. گوناحی من چییە. ئەو داماوە میوانە. هەڤاڵ و هاوکاری براکەشمە. لەوێوە هاتوە تا لەگەڵت قسە بکات. بۆچی تێناگەی؟

ـ نا یەلدا! ئەو درۆزنە. دەزانی لە تاران چۆنی شکاندم! ئەی بۆچی دەسگیرانەکەشی لەگەڵ خۆی نەهێناوە؟ بگرە دەیەوێ بەو کارانەی مەراق کوشم بکات. تازە بوون و نەبوونی ئەو لێرە،بۆ من گرنگ نییە. ئەوەتا من خەریکم دەگەڕێمەوە لای باوکم.

ـ تکایە سەیران! لەکەری شەیتان دابەزە! وەرە قسەی لەگەڵ بکە، بزانە قسەی دڵی ئەویش چییە؟ تکات لێدەکەم، دەس مەنێ بەڕوومەوە!

هەرجۆر بوو رازیم کرد. سەیران هاتە ژوورەکە. کاوە، هەرکە ئەوی دی، شڵەژا و قنج هەستایەوە سەرپێ. سەیران، ئاوڕی لە ئەو نەدەدایەوە و خۆی بە قسەکردن لەگەڵ من خەریك کرد. لە پڕ کاوە هاتە زار و وتی:

ـ سەیران! نامدوێنی؟!

ـ وا نییە! قابیلە تۆرابم! شتێکم بۆ باس کردن نییە.

ئەو هەلەم قۆستەوە و لە ژورەکە چوومە دەرەوە تا بە تەنیا قسەکانیان بکەن.

ـ گویّ بگره سەیران! من ئەو ڕێگا دوور و درێژەم بڕیوە، هەر بـۆ ئـەوەی قسـەت لەگـەڵ بکەم. کەچی تۆش ئاوەها لەگەڵم ئەجوولێیتەوە. ڕووم لیّ وەردەگێڕی! ئەی نازانی چەندە قسەم لە دڵدایە. ئەگەر ویستت، ئـەتوانی پـاش قسـەکانمان ئیـدی بـۆ تاهەتایـە نەمـدوێنی. ئـەو دەسگیرانەی کە بۆتم باس کرد، کەسێکی وەهمی بوو. ڕاستە کە من ئـەو ڕۆژە سـەبارەت بـە دەسگیراندارەبوونم باسم کرد، بەڵام خۆ نەمدەزانی تۆ تەلاقت وەرگرتوە. ویسـتم تـۆ دڵ لـەمن بەربدەی و ژیانت تێك نەدەی. بەڵام هەرکە زانیم تۆ تەلاقت وەرگرتوە، بڕیارم دا هەر ئەو ڕۆژە ڕاستییەکانت پیّ بێژم، بەڵام باشترم زانی ئەو کارە دوابخەم. باوڕ بکە دەسـگیرانێك لـە ئـارادا نییە. من بێجگە لە تۆ کەسێکی دیکەم خۆش ناوێت. لەوکاتەوە کە بۆ یەکەمجار تۆم لە ماڵی خان بینی، ئاوڕم لە هیچ ژنێك نەداوەتەوە. دڵی خۆمم لەویّ، لای تۆ دانا. داوام لێکـردی لـە سەیوان جیاببیتەوە، چونکە دەمزانی تۆ حەیفی بۆ ئەو. بەڵام تۆ بە گوێمت نەکرد، ئەوە بـوو منیش ڕێگای خۆمم گرت و چووم. من ئاشقی تۆ ببووم. دەشمزانـی کـە ئاخرەکـەی بـۆ خـۆم دەبیت، ئەدی چۆن دەتوانم ئاشقی ژنێکی تر ببم. ئامادەم بـە نرخـی گیانیشـم بیـّت، لەسـەر بڕیارەکەی خۆم پێداگربم. ئێستا ئەڵێی چی؟ تۆش ئەبیّ بڕیاری خۆت بدەیت.

ـ ئەگەر وایە، ئەی بۆچی ئەو هەموو ماوەیە، سۆراخێکت نەگرتم؟

ـ پاش ئەوەی توانیم ڕاستییەکان بخەمە ڕوو و ئەوانە ڕیسوا بکەم، کەوتنە شوێنم و توانیان ببنە هۆی دوورخرانەوەم. ئەڵبەت دەمتوانی بۆ سەردان بێمە ئێرە، بـەڵام نەمدەویسـت تـۆش ڕاڕایی بکەم و ببمە هۆی تێکچوونی زیاتری ژیانت. خۆت دەزانی کە بە چە شێوەیەك جوابـت کردم، لە بیرتە! هەستم دەکرد داشێکی[8] خوراوم و دەبیّ گۆڕەپانەکە جیّ بهێڵم. هەرچەند لـە ناخی دڵەوە دەسووتام و ژیانم وەك دۆزەخی لێهاتبوو. بیر و خەیاڵی تـۆ، تووشـی خـەمۆکییان کردم. دایم چاوەڕیّ بووم هەواڵێکت بگات. بەڵام وەرزەکان دەهاتن و ئەچوون و لە تۆ هەواڵێك نەبوو. دەزانی چ ڕۆژگارێکی سەختم تێپەڕاندوە؟ ماوەیەکی زۆر کەوتمە جێگا. گوشاری ڕوحی بووە هۆی مانەوەم لە ماڵەوە. کـەسوکارەکـەم بـەوەیان زانـی بـوو. بردمیانـە لای دوکتـور. ماوەیەکی زۆر دەوا و دەرمانم خوارد و ئەچوومە لای ڕاوێژکار تا کـەمێك هاتمـەوە سـەرخۆم. ساڵێك بەناچاری ئیزنم وەرگرت وەرگرت ونەمتوانی بچمە سەرکارەکەم. دواتر شوێنی کارەکـەم گواستەوە بۆ تاران. دەزانی بۆچی؟ دەبوا لە ژێر چاودێری دوکتـوردا بوومایـە و هـەر حەوتـە

---

٨- داش: مۆرەی دامە.

جارێك لە كرماشانەوە بچوومایەتە تاران. بۆیە باوكم بە هەزار دەردیسەری توانی كارەكان رێك بخات و شوێنی كارەكەم بگوازێتەوە بۆ تاران. ئەوە نزیكەی ساڵێكە، كەمێك بەرەو باشی دەچم. بەخۆدا هاتومەتەوە. ئێستاش ئەوەتا تۆ بە درۆزن و بێ بەڵێن تۆمەتبارم دەكەیت. نازانم چۆن بیر دەكەیتەوە؟ بەڵام لە هەڵەدای. بەوجۆرەش نییە كە تۆ دەزانی. من دووچاری شكستی گەورە بوومە. بێجگە لە تۆ، كەس ناتوانێ یاریدەم بدات. بۆچی مەگەر بەڵێنم پێ نەدابووی كە بێجگە لە تۆ كەس نەخوازم!

ـ قسەكانت تەواو بوون، كەواتە گوێ بگرە كاوە. من لەبەر خاتری تۆ ژیانی خۆمم تێك نەداوە. لە بەر دەرباز بوون لە چارەڕەشیەكانم ئەو كارەم كردوە. هەرگیز بۆ ئەوانەی لە دەستم داون، ئاخ هەڵناكێشم. چونكە بیرەوەریەكانم هەموویان پڕن لە تاڵە و سوڵە. ئەوەش ناشارمەوە تەنیا كەسێك كە دڵم پێی خۆش كردبوو تۆ بووی. هەستم دەكرد تەنیا لە بنپاڵی تۆدا دەحەسێمەوە. پاش تەڵاق گرتنەكەشم هەوڵی زۆرم دا، بەڵام نەمتوانی بتدۆزمەوە. تا ئەوەی ئاغە سیرووس بوو بە فریشتەی نەجات...

ـ كەواتە ئەی سیرووس چی؟ سەیران!

ـ ئەو هەر لەو رۆژەوە كە منی بینی ئاشقم بوو، بەڵام من بەڕووی خۆمدا نەمدەهێنا. تا ئەوەی لە لای خۆشك و دایكی، خوازبگێنی لێكردم. منیش لەبەر ئەو ئازارەی كە تۆ پێتدابووم ئەمویست كەمێك مەراقت پێ بدەم ئەگینا هەرگیز ئەوم نەویستووە. تەنیا بۆ ئازاری تۆ لەگەڵی دادەنیشتم و دەمدواند. ئاخرەكەشی بە بێ رووبینی و درۆ راستییەكەم پێ وت و دڵنیام كردەوە كە هیچ هۆگریەكم بەوەوە نییە. لێشم نەشاردەوە كە ئاشقی تۆم! لەگەل ئەوەشدا كە دەسگیرانداریش بوویت؟!

ئاشتبوونەوەی ئەوان لە رادەبەدەر دڵخۆشی كردم. پاش چەند رۆژێك كاوە گەڕایەوە كرماشان و بابەتەكەی بەلای بنەماڵەكەیەوە دركاند. باوك و دایكی كاوە، پێشتر لەماڵی خان، چاویان بە سەیران كەوتبوو و كەوتبووە بەردڵیان. هەربۆیە چەند رۆژی نەبرد هەموویان هاتنە هەورامان و بەلای باوكی سەیرانەوە خوازبێنیان لێكرد. بەوجۆرە داستانی ئەشقی كاوە و سەیران، بوو بە بنێشتە خۆشەی سەرزاری خەڵكی دەڤەر. باوكی سەیرانیش بەوكارە زۆر دڵخۆش بوو.

پاشان كاوە بەرەو كرماشان گەڕایەوە تا كاروباری زەماوەند رێك بخات. چەند رۆژێكی پێ نەچوو كە لەگەڵ خزم و كەس و كاری هاتن بۆ مارەبڕینی سەیران.

ئاهەنگەکەمان لـە حەوشـەی دەرمانگاکـەدا ڕێـك خسـت. شـەوق و شـادی ئـەو نـاوەی داگرتبوو. سەیران زۆر جوان بوو. هەرچەند سەرم لە ڕازاندنەوەی بووك دەرنەدەچوو، بـەڵام بـە یاریدەی یەکێك لە هاوکارەکانم، توانیم زۆر جوان بیڕازێنمەوە و ئارایشی بکەم. هەموو کـەس چاوی لەئەو بوو. دەنگی دەهۆڵ و زورنا دەگەیشتە ئەوبەری شاخەکان دەچوو.

منـیش بنەماڵەکـەم داوەت کردبـوو. بـەڵام دایکـم لەبـەر دووری ڕێگاکـە نـەیتوانی و سیرووسیش لە تاو مەراقی دڵی خۆی، نەهات.

سەیران، لەسەر کورسیەکە دانیشتبوو. دەسێ جلی کوردی ئاڵ و واڵای لەبـەر بـوو. چـاوە ڕەش و جوانەکانی دەدرەوشانەوە. ژن و پیاو سەرسامی ببوون. کاوەش لە خوشیان شاگەشـکە ببوو. باوك و دایکی کاوە و خوشکەکەی" پەرەستو، بە بینینی ئەو بووکە جوانەیان، لە هەموو کەس زیاتر خوشحاڵ بوون. باوکی سەیرانیش، کە داخی ژیانی کولەمەرگیی ڕابردووی سەیرانی لە دڵدا بوو، بە بینینی سەیران لە جل و بـەرگی بووکێنیـدا، هەسـتی بـەحەسـانەوە دەکـرد. عەساکەی لە باوەش نابوو و لە تەنیشت ئەحمەدخانی باوکی کاوەوە دانیشتبوو.

کچ و کوڕ، لە حەوشەی دەرمانگاکەدا خەریکی هەڵپەڕکێ بوون. گۆرانی شادی هـەورامی گوێی دەلاواندەوە. ئەو ڕۆژە، منیش دەسێ جلوبەرگی ئـاڵ و واڵای کـوردیم لەبـەر کردبـوو. نامەوێ تاریفی خۆم بکەم، بەڵام ئەو جلانەم زۆر لێ دەکاڵانەوە. هەربۆیە شاگەشکەم دەکـرد. کاوەش دەسێ چۆخەڕانکی جوانی لەبەر کردبـوو. لـە جـاران زۆر جـوانتر بـوو. هەرچـەند بـە قولێکی سەیران دیارە بە نیودانگی سەیران نەدەبوو. ئەو شاجوانی هەورامان بوو. بە جۆرێـك کـە گەورەکچـان بـە حەسـرەتەوە بۆیـان دەڕوانـی. جوانییەکـەی خـودایی بـوو و چـاو، لـە تەواشەکردنی تێر نەدەبوو. کاوە و سەیران، ئەڵقەی دەسگیرانیان لە پەنجەی یـەکتر کـرد. لـەو کاتەدا دەنگی چەپڵە ئەو ناوەی داگرت. نوقڵ و پارە، وەك باران بەسەر بووك و زاوادا بـارین. داوا لە بووك و زاوا کرا تا بۆ هەڵپەڕکێ هەسـتنەوە. سـەیران سـەرەتا ڕازی نەئـەبوو، بـەڵام لەسەر پێداگری من ڕازی بوو. چە هەڵپەڕکێیەك. چاوی هـەموانی بردبـوو. هـەردووکیان زۆر جوان و بە بەژن بوون. وەك دوو کۆتر دەهاتنە بەرچاو. سەیران هەستی بە ماندوو بوون کـرد و دەستی بەردا. بەڵام کاوە گەرمی کردبوو. باوك و دایکیشی بەردەوام شاباشیان دەدا. بـاوەژنی سەیرانیش لە نیزیك منەوە دانیشتبوو. خەریك بوو دەتەقی. بڕێجار لێـیم ئـەڕوانی تـا بـزانم هەڵسوکەوتی چۆنە. جارجار ئاورێکم لـە سـەیرانیش دەدایـەوە و زەردە خەندەیـەکم دەکـرد و

ئەویش بە بزەیەك، وەرامی دەدامەوە. ئەوە یەکەمجار بوو کە هەستم دەکرد سەیران هەست بە هیوا و ئاسوودەیی ئەکات.

ئاهەنگەکە بە باشی بەڕێوە چوو.

زستان وردە وردە خەریك بوو بـاروبنـەی دەپێچـایەوە. لەحەوشـەکەدا هـەموو بـەفرەکان توابوونەوە. شـەماڵ، جێگـای بـۆرانی ئەگرتـەوە. شـاخەکان، وردەوردە لـە ژێـر بەفرەکـەوە دەردەکەوتن و ڕێگاوبانی ناوچەکە باشتر دەبوو. بەڵام وەهمی هەرەس و بـۆران، هـەروا لـەدڵی خەڵکەکەدا بنجی داکوتابوو.

باوك و دایکی کاوە، سەربەرز بەوەی کە بووکێکی وەهـا جوانیـان دەس کـەوتوە، لەگـەڵ میوانەکانیان گەڕانەوە بۆ کرماشان. لە نێو هەموو ئەو دیارییانەدا کە بۆ سەیرانیان هێنابوو، ئەنگوستیلەکەی کاوە، مانایەکی دیکەی هەبوو. من بـەو هەسـتەی سـەیرانم زانیبـوو. بۆیـە ڕۆژێك هۆکاری ئەو هەستەم لێپرسی.

خۆی لێی دزییەوەو هەڵیگرت بۆ دوایی. منیش زۆر لەسەری نەچووم. ڕاستیەکەی هەسـتم دەکرد شتێکی دیکە لە ناخەوە ئازاری سەیران دەدات. شێلگیرتربووم کە بزانم چ شتێك ئازاری دەدا.

وتی: شتێکی گرنگ نییە. تەنیا جاروبار سەرم لە گێژەوە دەبێ. خۆشم نازانم بۆ؟

ئەوە بوو کە بڕێ پشکنینم بۆ سەیران نووسـی. بـەڵام شـتێکم دەسـت نەکـەوت. درێـژە کێشانی ئەو سەرەگێژەیە هانی دام تا کاوە ئاگادار بکەمەوە و داوای لێبکەم سەیران بباتە لای دوکتۆری پسپۆڕ. کاوەش لە کەمترین ماوەدا خۆی گەیاندە ئەوێ.

لەوەزعی سەیران ئاگادارم کردەوە. و پێم وت کە باشترە بیباتە لای دوکتوری شارەزا.

کاوە زۆر ترسابوو. داوام لێکرد تا لەسەرخۆ بێت. و ئەوکارە بکات.

بەگوێی کردم. بەڵام بە مەرجێك ڕاستییەکەی پێ بێژم. منیش هـەموو شـتێکم بـۆ بـاس کرد.

زۆر شڵەژا. ڕەنگی بە رووخسارەوە نەما. لەبەر خۆیەوە وتی: ئێستا کە بـە ئەشـقی خـۆم گەییشتووم......

ـ نا کاوە بیری خراپ مەکەوە. شتێکی ئەوەندە گرنگیش نییە. جۆرێك ماندووبوونە. دەبێ لەوە ئازا و خۆڕاگرتر بیت.

ـ دەزانی چییە یەلدا! ئامادەم لە ڕێگای سەیراندا هەموو شت لە دەس بدەم. دەزانی چۆن توانیومە بەدەسی بهێنم؟ نا باوەڕ ناکەم بزانی چەندەم خۆش دەوێت!

دەزانی چییەکاوە،تۆ دەبێ بەشتێکی دیکەش بزانیت، بە بێ ئەوەی کار بکاتە سەر خوشەویستی سەیران!

ـ ئەوە چییە یەلدا؟

ـ دەبێ ئەو ڕاستییەش بزانیت کە سەیران نەزۆکە!

ـ ئەوە گرنگ نییە. من خۆیم خوش دەوێت. نەك منداڵ و کار و پیشە. ئەوە قسەی دڵمە. ئەگەر کەسێکت لەبەر شتێك خۆش بوێت، دێر یان زوو، لەدەسی دەدەیت. بەیانی زوو دەیبەمە تاران.

لەگەڵ کاوەدا سەیرانمان ڕازی کرد کە دەبێ لەگەڵ کاوەدا بڕوات بۆ تاران. سەرەتا ئەو ڕازی نەدەبوو. بەڵام وتمان ئەوە سەفەری بەر لە زەماوەندەکەتانە. دەبێ بڕۆیت تا کەمێك ورە بگریت و بەخۆتدا بێیتەوە.

ـ سەیران! وەك دڵی خەبەری دابێ، وتی: من هەست بە هیچ ئازارێکی جەستەیی ناکەم. تەنیا جاروبار سەرم لە گێژەوەێ. پێموایە هۆکارەکەی هی کەم خوێنی بێت.

بەیانییەکەی سەعات هەشت کەوتنە ڕێ. ئیتر من بە تەنیا مامەوە و دونیایەك بیر وخەیاڵ. یەکێك لە خانمەکان، شەوانە بەلامەوە دەخەوت. بەردەوام بیرم لە سەیران و ڕابردوو و داهاتووی دەکردەوە. تا ئەوەی ڕۆژێك تەلەفۆنی کرد:

ـ سڵاو

ـ سڵاو سەیران گیان! ئەوە لە کوێی؟

ـ لە ماڵی ئێوەم. دایکە سڵاوت لێ دەکات.

ـ بڵێ بزانم چیتان کرد! چوونە لای دوکتور؟

ـ ئەرێ دواتر بۆتی باس دەکەم. ئێستا کارێکت نییە؟

ـ نا ئازیزم، ئاگاداری خۆت بە. ڕاستی ئەی کاوە لە کوێیە؟

ـ چووە بۆ ماڵەکەی خۆی.

ئەو پێوەندیە خوشحاڵی کردم و خەیاڵم ئاسوودە بوو. ماوەیەك بوو کە بەکاروباری نەخۆشەکانەوە خەریك بووم. شەوێك کە لە تاو ماندوویەتی خەو بردبوومیەوە، خەوم دی کە

سەیران لە ڕۆخانەیەکدا غەرق بووە. لەترسان ڕاچڵەکام. ئازای گیانم ئارەقی بەردابوو.نازانم چۆن ڕۆژم کردەوە. خێرا تەلەفۆنم بۆ ماڵی خۆمان کرد. دایکم وتی:

ـ سەیران هەندێ پشکنینی بۆ کراوە. ئێستاش لەگەڵ کاوەدا چوون بۆ هێنانەوەی ئاکامەکەی.

ـ هەواڵی وەزعی سەیرانم لە دایکم پرسی. وتی خراپ نییە و زۆر لەسەری نەڕۆیشت تەلەفۆنەکەی داخست.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی هەینی خەریکی حەسانەوە بووم کە دۆستێکم بانگی کردم و وتی: وەرە ئیشیان پێتە.

باوەژنی سەیران لە دەرەوە چاوەڕێی دەکردم. بە دەممەوە هات وتی:

ـ خانم دوکتور خێرابە! تکات لێدەکەم فریامان کەوە، باوکی سەیران هیلاکە.

خێرا خۆم ئامادە کرد و کەوتمە ڕێ. شکۆفە نیگەران بوو. جاروباریش پووکەیەکی دەکرد. جارجاریش دەکەوتە بۆڵەبۆڵ.هەرخۆی دەیزانی چی ئێژێ! منیش دەڵێم دەدایەوە تا گەییشتینە ئەوێ. باوکی سەیران بووڕابۆوە. ئازا ترپەی دڵم گرت. باش نەبوو. بانگم لێکرد: ئاغە فەرەج! ئاغە فەرەج!

دەنگەکەی ناسیمەوە. بە هەزارحاڵ وەڵامی دایەوە: کچەکەم لە کوێیە؟

ـ خەمی ئەوت نەبێ، ئەو باشە. چەند ڕۆژێکە لەگەڵ کاوەدا چوون بۆ تاران، هاکا گەڕانەوە! خۆت چیتە!مامەگیان، شوکور باشتری؟

ـ وامن خەریکە دەمرم دوکتور! تۆ بیت و خودا بەڵێنم پێ بدە کە ئاگاداری سەیران بیت. تۆ بۆ ئەو، باشەی زۆرت کردوە. بۆ ئەو جێگای باوك و دایك و خۆشکیشی. بەڕاستی تۆ دۆستێکی ڕاستەقینەیت. ئێرەییت پێ دەبەم کچم! ئێوە لە بنەماڵەیەکی باشن. سەیران دڵی بە کەس خۆش نەدەکرد،بەڵام تۆ وەك گەوهەرێك لای ئەو ئەدرەوشایتەوە. ورەت پێئەدەدا. هیوات پێ دەبەخشی. ئەوەی تۆ کردووتە، منی باوکیش نەمکردوە.هەرگیز خۆم نابەخشم. ئەگەر بتوانم بمێنم تا جارێکیتر بیبینم ئەوا شاکارم کردوە. من لە ژیانمدا نەمتوانیوە بۆ ئەو باوکێکی باش بم.لەشەڕ بەولاوە هیچ نەبووم. هەرلە منداڵیەوە لە نازی دایك بێبەش بوو. لە نۆلاویشدا تووشی بوو بە تووشی بەڵای باوەژنەوە. کە ڕۆشتە ماڵەبەختیش، شوو و خەسووی بۆی بوون بە بەڵا و کەوتنە گیانی. کچم! ئەوە چە باوکێکە کە کچەکەی لە ماڵی دۆستیدا زەماوەندی بۆ بکرێت؟

ـ نا بابەگیان، ئەوەندەش نیگەران مەبە. ئەی ئەوە نەبوو بۆ خۆشت لەوێ بەشـدار بـووی؟ سەیران ئەو ڕۆژە هەر بۆتۆی دەڕونی. ئەزانی چە شەپۆلێك لە نیگاکانیدا بەدی دەکرا.

ـ کچم! راستم پێ بێژە، سەیران بۆچی چووە بۆ تاران؟

ـ شتێکی ئەوتۆ نییە. کاوە هاتبوو بە شوێنیدا. بردی تا کەمێك بحەسێتەوە.

ـ راستم پێ بێژە! ئەی چۆن منی لە چوونەکەی ئاگادار نەکردەوە؟ بۆچی من بێگانەم!

ـ بابەگیان! راستەکەی سەیران کەمێك نەخۆش بوو. سەری لە گێژوە دەهات. لەسەر داوای من چوون بۆ تاران.

ـ ئەی خوایەگیان! من تەنیا سەیران شك دەبەم. ئێستاش بەم هەموو عەزابەوە، چۆن خۆم بگرم؟ تۆخوا دوعای خێری بۆ بکەن!

ـ مەترسە! ئیشەڵلاً شتێك نییە! دۆعای خێری بۆ بکە.

سەیران و کاوە بیست ڕۆژێکیان پێچوو. گەرمەی بەهار بوو کە گەڕانەوە.

بە بینینی سەیران شاگەشکە بووم. منیش وەك کاوە ئاشقی سەیران ببووم. ئەو دەسێ جلی تازەی لەبەر کردبوو. زۆری لێ جوان بوو.

ـ خوایەگیان ئەو هەموو جوانییەی لە کوێ هێناوە؟!

بەتایبەت کە جل و بەرگی جوانی دەکردەبەری، جوانییەکەی خۆشی چەند هێنـدە دەبـوو. هەرچەند کەمێك لاواز ببوو. بەڵام هەستم کرد ئەوە هی ماندوویـەتی ناوڕێگـا و نەخـەوتن و دەوا و دەرمان بێت. سەوقاتێکی جوانی بۆ هێنابووم. سـەعاتێکی دەسـتیی گـرانبـایی. بـۆ میتراش" سەرپۆشێك و بۆ باوکیشی کراسێك. تەنانەت کراسـێکی بـۆ باوەژنیشـی هێنـابوو. دیارییەکانی، منیان لە خەمی غەریبیدا نوقم کرد. بەلامەوە زۆر بەنرخ بوون.

بێ دزبەدزییەوە، وەزعی سەیرانم لەکاوە پرسی. وتم با خۆی نەزانێت و پێی زویر نەبێت.

کاوە وتی: ئەزانی چییە یەلدا! سەیرانم بـردە لای چـەند دوکتـوری شـارەزا. ئـەوان بڕێـك پشکنینیان بۆ نووسی، بەڵام بارودۆخی باش نییە!

ـ چۆن کاوە!تکایە باسی بکە.

ـ دەترسم تاقەتی بیستنی ئەو هەواڵەت نەبێت!

ـ نە، توخوا بڵێ بزانم!

ـ راستییەکەی سەیران تووشی شێرپەنجە بووە. (تۆمۆری) مێشك!

به بیستنی ئەو هەواڵە، شل بووم و خۆم پێ ڕانەگیرا. ئازای گیانم لەجووڵە کەوت. کاوە فریام کەوت. ڕاستی کردمەوە و لیوانێك شکراوی پێدام. بۆ ماوەیەك نەمتوانی لێو بکەمەوە. تا ئەو کاتە هەواڵێکی بەو تاڵیەم نەبیستبوو. دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە. دەمگوت: بەشکەم درۆ بێت و کاوە گاڵتەم پێبکات. یان گەرەگیە تاقیم بکاتەوە بزانێت تا چەند سەیرانم خۆش گەرەکە. بۆیە ووتم:

ـ واز بێنە کاوە! ئەو گاڵتەبازاڕیەت لە چییە؟

ـ نا یەلدا! ئەوە ڕاستییەکە. ڕاستییەکی تاڵ. سەیران لە دۆخێکی باشدا نییە.

ـ بەرگەی ئەو هەواڵە ناگرم. سەیران هێشتا گەنجە. ئاواتی زۆری لە دڵدایە. ئێستا خەریکە بە خۆشییەکانی ژیانی ئەگات. بۆچی ئەبێ ئەم کارەساتە بقەومیٚ؟

ـ نازانم یەلدا! ڕەنگە خوا بیەوێ منو تۆ تاقی بکاتەوە. بڕوا بکە لەو کاتەوە سەیرانم بۆ تاران بردوە، ساتێکیش ئارامم نیم و ئۆقرەم لێبڕاوە.

ـ کاوە! ئەریٚ خۆیشی بەو وەزعەی زانیوە؟

ـ نا یەلدا. شتێکم پیٚ نەوتوە. نامەوێ ئاگادار بێت. بەرگەی ئەو هەواڵە ناگرێ.

ـ ڕاستییەکەی ئەو سەرگێژانەی منیان دوودڵ کردبوو. دەمگوت نەکا شتێکی بەسەر هاتبیٚ. باشە ئاخر قسەی دوکتۆرەکان چی بوو؟

ـ وتیان شێرپەنجەکەی تەشەنەی زۆری کردوە. هەرچەند مانگێکی دیکە دەژی. دەیان گوت: ئاخریەتی. بیٚ دڵی مەکەن. ئارەزوەکانی بەجیٚ بێنن.

داوام کرد تا بیبەمە دەرەوەی وەڵات. بەڵام بیٚهیوایان کردم. وتیان سوودێکی نابێت. باشترە بیبەنەوە ماڵەکەی خۆی تا بحەسێتەوە. بیسپێرن بە خودا. مان و نەمان بە دەستی ئەوە. یەلدا! نازانم دەبیٚ چی بکەم؟ وا خەریکە خۆشەویستەکەم بەبەرچاومەوە دەژاکیٚ و هەڵدەوەرێت و چم لە دەس نایەت!

کاوە خەریك بوو قژی خۆی دەڕنییەوە و دەگریا. ناهەقیشی نەبوو. چۆن دەکریٚ ئەو پارچەخۆرە لە دەس بدات. کاوە سیٚ ڕۆژ لەویٚ مایەوە. ماوەی ئیجازەکەی تەواو بوو. سەیرانی وەك ئەمانەت دایە دەستی من و خۆی گەڕایەوە. کاتی ماڵئاوایی، دەستی کردە ملی. ماچی کرد و فرمێسك بە چاوانیدا داگلان. سەیرانیش بە ئەنگوستە نەشمیلانەکانی فرمێسکەکانی دەسڕیەوە. بەڕاستی دیمەنێکی جەرگبڕ بوو. کاوە، کاتیٚ ویستی لە من جیا ببێتەوە گوتی:

ــ یەلدای ئازیز! تۆ وەك خوشكێكی دڵسۆزی. وەك برایەك داوات لێ دەكەم، تا ئەگەڕێمەوە ئاگاداری سەیران بە. ئەگەر پێویستی كرد ئاگادارم بكەرەوە. هەندێك پارەی ناقابلیش دادەنێم تا بدەیتە دەست سەیران.

من هەروا بۆم ئەڕوانی. بۆیە وتی: چییە یەلدا، شتێك رووی داوە؟

ـ نا شتێك نییە. پووڵەكە هەڵبگرەوە. پارەمان لایە.

زستان، بە هەموو جوانییەكانییەوە چوو و جێگای خۆی بە بەهار دا. هەورامان هێشتا سارد بوو. بەڵام بەهار مزگێنی هاتنی گەیاندبوو. درەخت شكۆفەی كردبوو. مەلەكان كەوتبوونە خۆ. نەغمەی كەو، بە كوێستانەكانەوە ئەزرنگایەوە. راوچییەكان خەریك بوو بەرەو راوگەكان ئەچوون. شەڕەبەق، نەریتێكی خۆشی راوچییەكانی هەورامانە. بەتایبەت باوكی مینا لەو بارەوە باسی زۆری بۆ دەكردم. بۆیە ئاواتم دەخواست بتوانم لەگەڵیێ بچم بۆ راو. ئەوە خستمیەوە بیری مینا. رۆژێك چووم بۆ ماڵیان. لە دەرگاكەم دا. بەڵام دراوسێكەیان وتی: ماوەیەكە كۆچیان كردوە بۆ مەریوان. ناونیشانی ماڵەكەیانم لێ وەرگرتن و بڕیارم دا رۆژێك لەگەڵ سەیران سەردانی بكەین. گەڕامەوە و هەواڵی كۆچ كردنی مینام بە سەیران دا.

وتی: هەر وتم بۆچی نەهاتوە بۆ ئاهەنگەكەم!

وتم: چەند رۆژێك ئیجازە وەردەگرم. دەچین سەردانێكی دەكەین.

ـ باشە. بەڵام بەر لە چوونمان، باشترە سەرێك لە باوكم بدەم.

ـ ئای سەیران گیان، بڕوابكە لە یادم نەماوە پێت بێژم كە باوكت داوای لێكردم كە گەڕایتەوە، سەردانێكی بكەیت. زۆر بۆت بە پەرۆشە.

بڕیارمان دا دەمەو عەسر، بڕۆینە لای باوكی. سەیران بڕێك میوە و شیرینی كڕی. ئەو دیارییانەشی هێنا كە لە تاران بۆی سەندبوون. هەركە لە دەرگاكەمان دا، باوەژنی دەرگاكەی بۆ كردینەوە. بە بینینی ئێمە زۆر خوشحاڵ بوو. سەیرانی ماچ كرد. سەیران هێشتا كینەی زووی لە دڵدا بوو، بەڵام بەڕووی خۆی نەئەهێنا. باوكی بەسەر نەوگێكی جوانی هەورامانەوە پاڵ كەوتبوو. سەری خستبوە سەر سەرینێك و ئارام ئارام هەناسەی ئەدا. بە بینینی سەیران، چاوەكانی پڕ بوون لە فرمێسكی شادی. دەسی كردە ملی سەیران و باوك و فەرزەند بانگی گریانیان هەڵدا. دیمەنێكی پڕ سەرسام بوو.

ـ ئازیزم! لە كوێ بووگی؟ بۆچی بێخەبەرت كردم. دڵم بۆت داگیرا بوو. تاكەی گەرەكتە ئاوەها ئازارم بدەیت. نازانی نەخۆشم و هەركەت زانی بۆ هەمیشە بە جێم هێشتی؟

ـ نا بابە گیان! من تۆم خۆش دەوێت. هەرچەند پێشتر لێت دڵگیر بووم، بەڵام ئیتر رابردووم لەبیر بردوەتەوە. تۆ خۆشەویستمی.بۆ من بەنرخترین گەنجینەی ئەم عالەمەی.

ـ کچم! یەلدا خانم باسی سەفەرەکەی تارانتی بۆ کردم.

ـ ئەریٚ، چەند رۆژێکمان پێچوو. کراسێکی جوانم بۆ هێناوی. هیوادارم لێمی وەربگری.

ـ کچم! دیاریی تۆ دەوای ئازارەکانی منە. لەسەر چاوانمی دادەنێم تا بەشکەم نووریان زیاتر بێت!

ـ شکۆفە خانم! ئەوەش دیاریی تۆیە.

باوەژنی کراسەکەی ماچ کرد و زۆر پێی خۆشحاڵ بوو.

ـ راستی باوکە، درەختی حەوشەکەمان گوڵی پشکووتوە؟ ئـەزانی کـە ، بـەهار دووبـارە گەڕاوتەوە!

ـ نا کچم! وابزانم سەرمای زستان وشکی کردوە.

سەیران بە بیستنی ئەو هەواڵە راچڵەکا. خێرا بەرەو حەوشەکە چوو.

باوکی سەیران لە منی پرسی: چییە یەلدا! کەمێك نیگەران دێنە بەرچاو.

ـ شتێکی تایبەت نییە. زۆر ماندووم. هی کاری دەرمانگاکەیە.

ـ راستم پیٚ بێژە. سەیران شتێکی بووە؟

ـ نا وا نییە. هەموو تاقیکردنەوەکانی ئاکامی باشیان بووە. شوکور بۆ خـودا سـلامەتە. لەوانەیە تا چەند رۆژیتر بڕۆین بۆ مەریوان بۆ ماڵی مینا.

بەسەزمان، بەو هەواڵە زۆر خوشحاڵ بوو. وتم بۆچی ئەبیٚ هەواڵێکی تاڵی پێبدەم؟ با لـەم ئاخری عومرەوە دڵخۆش بێت.

ـ راستی باوکە! درەختەکەم وشك بووە. ئیدی چرۆ ناکات. باشترە نـەمامێکی دیکـەم بـۆ بنێژن.

ـ نا کچم! ئەو درەختە یادگاری تۆیە. باشترە لەویٚ بێت. تەنانەت ئەگەر بە وشکیش بێت.

پاش چەند سەعاتێك گەڕاینەوە ماڵ. سەیران وتی کـە هەسـت بـە ناخۆشـییەك دەکـات. ئەیگوت: هەست دەکات لەو سەفەرەی مەریوان، بەسلامەتی ناگەڕێتەوە.

ـ بۆچی وا بیردەکەیتەوە. من هەفتەیەك ئیجازە وەردەگرم و دەڕۆین.

ـ بەڵام یەلدا! ئارەزووی چنوور و شاهۆم کردوە. دەزانی لە کەیەوە لێیان بێخەبەرم.

ـ باشە. ئەگەر پێت خۆشە، دەچینە لایان.

پێکەوە بۆ سەردانیان چووین. بەڵام ژنەکەی سەیوان وتی کە چنوور لە ماڵ نییــە. لەگــەڵ دایەگەورەی چووە بۆ ماڵی مامەی. شاهۆش لە بازاڕە. لای باوکی.

سەیران وتی: کە هاتنەوە، سڵاوی منیان پێ رابگەیەنە. پێیان بێژە کە هاتووم بیانبینم.

گەرمەی بەهار بوو چووین بۆ مەریوان. مــاڵی میناـمــان دۆزیــەوە. پێــك‌گەییشــتنی دوو دۆست دیمەنێکی زۆر بەتامی هەبوو. شوەکەی میناش، پیاوێکی بــاش بــوو. مامۆســتا بــوو. کەمدوو بوو. میناش یەکەمین و ئازیزترین دۆستی سەیران بوو. چەند رۆژێك لــەوێ ماینــەوە. میناش، وردە وردە لە سەرگێجەکانی سەیران ترسی لێ نیشتبوو و بەردەوام هۆکارەکــەیی لــە من ئەپرسی. بەڵام من خۆم لێ دەبوارد و هەوڵم دەدا باسەکە بگــۆڕم. رۆژێــك کــە دووبــەدوو بووین، پێی داگرت کرد کە ئەو هۆکارەی پێبێژم.

ـ دەزانی مینا! سەیران دووچاری شێرپەنجە بووە. توموری مێشکی گرتوە. نــەم دەویســت ناڕەحەتت بکەم، خۆت پێداگریت کرد.

مینا زۆر ناڕەحەت بــوو. زۆر گریــا. دڵــداریم دایــەوە و وتم: تــازە کارێکمــان پێناکرێــت. خەفەتیش دەردێك دەوا ناکات.

ـ نازانم بۆچی؟ هەست دەکەم پشووم سوارە. بەسەزوان، رۆژێکی خۆشی نەدیوە. با بیبەین بۆ تاران! بگرە لەوێ چارەسەر بکرێت!

ـــ تازە سوودی نییە. دوکتورەکان وتوویانە تــەنیا چــەند مــانگێتر دەژی. بــا لــەم مــاوە کورتەدا نازی بکێشین.

ـ ئەی کاوەی داماو چۆنە؟

ـ جا چون بێت؟ خەریکە مەراق دەیکوژێت. ئەمڕۆ دوو جار تەلەفۆنی بۆ کردووم.

ـ چی دەگوت؟

هیچ. هەواڵی سەیرانی دەپرسی. وتی کە حەوتەی داهاتوو بۆ کارێك دێتە مەریوان. منیش گەرەکمە بڕۆم و داوا بکەم تا کارەکەم بگوازنەوە ئێرە. بگرە لێــرە باشــتر بتــوانین لــە ســەیران بپرسینەوە.

ـ ئەرێ وایە. ئێرە دوکتوری باشتری لێیە.کەرەستەکانیشی باشترن. ئەگــەر پێویســت بــوو دەتوانین بیبەین و لە نەخۆشخانە(بیمارستان) بیخەوێنین.

ماوەیەك بوو لە مەریوان میوانی مینا بــووین. ئیجازەکــەم خــەریك بــوو تــەواو دەبــوو و خۆمان بۆ گەڕانەوە ئامــادە دەکــرد. لــە پــڕ نامەیــەکم پێگەییشــت. لــە لایــەن بەرپرســانی

پەیوەندیدارەوە داوای راگواستنەکەم بۆ مەریوان پەسەند کرابوو. ئـەوە هەواڵـە بـوە هۆکـاری خوشحاڵیمان. سەیرانم لای مینا دانا و بۆ خـۆم گەڕامــەوە هــەورامان و کەلوپەلەکـەم هێنـا. لەگەڵ مینا چەند رۆژ بە شوێن ماڵـدا گـەڕاین تـا توانیمـان ماڵێـك لـە نهـۆمی دووهــەمی باڵەخانەیەك بدۆزینەوە. لە نهۆمی یەکەمیدا خاوەن ماڵەکەی تێدا دەژیا. نهۆمی دووهەمیش لە هەیوانێك و دوو ژوور و چێشتخانە و حەمام و ئاودەس پێکهاتبوو. لە پەنجەرەکانەوە بڕێـك لە دیمەنە جوانەکەی سروشتی مەریوان دەبینرا. خاوەن ماڵەکەم ژنێـك بـوو و شـەش منـداڵی هەتیو. کوڕێك و پێنج کچ.

کەلوپەلەکــەمان گواســتەوە نێــو ماڵەکــە و دامــان مەزرانــد. ئەوەنــدەش زۆر نــەبوو. چراگازێك[٩] و یەخەچاڵێکی[١٠] بچکۆلە و بـڕێ کـەل وپـەلی مەتبـەق و دوو قـاڵی و دەسـێ مۆبل. مووچەکەم ئەوەندە زۆر نەبوو. من هێشتا خەریکی تێپەڕاندنی تاقیکاری بووم. کاوەش پەیتا پەیتا پوڵی بۆ سەیران دەنارد. شتێکمان کەم نەبوو. من رۆژانە دەچوومە سەر کارەکەم و سەیرانیش لە ماڵەوە کاری دەکرد. جاروبـار لەگـەڵ مینـا سـەری یـەکتریان دەدا. وردە وردە سەیران بە مەریوان رادەهات. سەرئێشەکەی خەریك بـوو نــەدەما. ئەمــەش هیوایـەکی زۆری پێبەخشی بووم.

کارەکەی من لە نەخۆشخانەیەکی مەریواندا بوو. بڕێ لە رۆژەکانیش دەچووم بۆ ســەردانی گوندەکانی دەوروبەری مەریوان. لە کارەکەم رازی بووم و حەزم پێدەکرد.

ماوەیەك بەو جۆرە تێپەڕ بوو. رۆژێك لەســەر کـارەوە گەڕامــەوە مـاڵ. کەوشـی زۆر لـە بەرکەوشکەنەکەدا بوون. لام دەگمەن بوو. بە خۆمم وت: باشە ئەم هەموو کەوشــە لــە کوێــوە هاتوون! بە پەلە لە دەرگام دا. سەیران هات و دەرگاگەی کردەوە. وتی: سـڵاو یەلـدا. دەزانـی میوانی زۆرمان هەیە. ماڵی ئەحمەدخان هاتوون.

چوومە لایان و سڵاو و ئەحواڵپرسیم لێکردن و ئەحواڵی کاوەشم پرسی؟

وتیان: ئەویان لەگەڵ نییە. کە هاتوون ئاگاداریان کردۆتەوە ئاگاداریان کردوە بەڵام ئەو، تا حەوتەیەکی دیکە پێی ناکرێ بێت.

---

٩- لایت.

١٠- سەلاجە.

سەیران لە تەنیشت خەسووی دانیشتبوو و باسی رابردووی بۆ دەکرد. خەزووریشی چاوی لێ کل نەدەکرد. روانینەکەی هێندە پڕبەزەیی بوو کە ئەتوت هەر ئێستا لە کلپەی گریان دەدات. پاش ماوەیەك، ئەحمەدخان و سەیران لە ماڵ مانەوە و ئێمە چووینە بازاڕ. دایکی کاوە لێی پرسیم:

ـ دوکتور یەلدا! تۆ پزیشکی. دڵنیام سەبارەت بە نەخۆشی بووکەکەمان زیاتر دەزانی. ئاخۆ سەیران ئەتوانێ چاك دەبێتەوە؟

ـ ئەوە لە دەستی خودایە. بەسەزوان وەك مۆم خەریکە دەتوێتەوە. خۆی هێشتا ئاگاداری نەخۆشییەکەی نییە. ماوەیەك بەردەوام لە هۆکاری بەردەوامی سەرئێشەکەی دەپرسێ. منیش نازانم چۆن دەس بەسەری بکەم. لە وەڵامەکەی خۆم دەدزمەوە.

خۆشتان ئەزانن ئەو نەخۆشە و لەوانەیە تەنیا بۆ چەند مانگیتر لە ناوماندا بێت.

ـ نازانم یەلدا! رەنگی بە روخسارەوە نەماوە. کێشی زۆر دابەزیوە. کوڕەکەشم هەروایە. ئەوەندە خەفەتی دەخوات، خەریکە لەدەس دەچێ. گەرەکیان بوو لەگەل باوکی بیبەنە دەرەوەی وڵات. بەڵام پزیشکەکان ئیجازەیان نەدا. دەیانگوت ئەگەر سواری فڕۆکە ببێت تێك دەچێت و سلامەتی دەکەوێتە خەتەرەوە. وابزانم باشترە هەرچی زووە زەماوەندیان بۆ بکەین. با سەیران بێنێتە تاران. ئەمە ئاواتی لە مێژینەی کاوەیە.

کچم! من سەیرانم وەك کاوە خۆش گەرەکە. تەنیا کاوەم هەیە. ئاواتم ئەوەیە زەماوەندەکەی ببینم. بەڵام باوکی بەو زەماوەندە رازی نییە. ترسی ئەوەی هەیە بەر لە مەرگی سەیران، منداڵیان ببێت. دەڵێت منداڵی بێ‌دایك چۆن بەخێو دەکرێت! وانەزانن کە ئەحمەدخان سەیران خۆش ناوێ؟ زۆریش خۆشی دەوێت، بەڵام ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە هەرچیمان کردوە جارێ با هەوڵ بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشییەکەی سەیران بدەین.

ـ ئەی کاوە چی دەڵێت؟

ـ ئەو لای وایە کە حەوتەی داهاتوو زەماوەند بکات. منیش هەر ئەو باوەڕەم هەیە. چونکە دڵنیام پاش سەیران، کاوە هیوابڕاو دەبێت. هەرگیز زەماوەند ناکاتەوە. باشی ئەناسم، خۆم گەورەم کردوە.

راستی سەیران! دەمێکە پرسیارێکم لا درووست بووە! ئەرێ چۆنە تۆی فارسزمان و تارانیی، لەگەڵ سەیرانی کوردزمان و هەورامانیی، ئەوەندە یەکتریتان خۆش دەوێت؟!

ـ ئەی خۆت چی، شیواخانم! ئێوە چۆن چۆنی ئاشقی سەیران بوون و ئیجازەتان دا ببێتە بووکتان. ئەویش بێوەژنێکی نەخوێندەوار!

ـ چەند ساڵی پێش، لەگەڵ بنەماڵەکەم بووینە میوانی خانی هەورامان. با کوڵك و مووی زۆر شی نەکەمەوە. وردەوردە تێگەیشتم چ زوڵمێك لە سەیران دەکرێت. لێی نیزیك بوومەوە. هەرچی لە دڵدا بوو بۆی گێڕامەوە. ئەمزانی کاوەش ئاشقی ئەو بووە.

یەلدا خانم! بۆخۆشم هاوتای سەیرانم. منیش قوربانییەکی وەك ئەوم. بەڵام ئەو لە هەورامان و من لە کرماشان. حەز دەکەی بۆتی باس بکەم!

وتم: ئەرێ زۆریش حەز دەکەم.

ـ من کچێکی خێڵی جافەکان بووم. جافەکانی زەردۆیی. لە بنەماڵەیەکی ناودار و خاوەن کولتوور پەروەردە کرابووم. ئەوە بوو کە لە ئازارەکانی سەیران بە باشی تێدەگەییشتم و زامەکانیم بە هی خۆم دەزانی.

من کچی پیاوێکی دەوڵەمەند بووم. باوکم دووکانێکی گەورەی هەبوو. ئێمە لە نێو تیرەی جافی زەردۆیی سەربەجوانڕۆ دەژیاین. ناوی باوکم ستارخان. ئەو پیاوێکی دەست ڕۆییشتوو و زۆربڵە بوو. دایکیشم حەلاوی ناو بوو. ژنێکی جوان و لەسەرخۆ. بەڵام باوکم دایم چاوی لە ناموسی خەڵکیتر بوو. دایکیشم لە بەر منداڵەکانی ناچار بوو ئەو دۆخە تەحەمول بکات. دیوەخانمان هەمیشە پڕبوو لەمیوان. دایکم ناچار بوو لە هەموویان میوانداری بکات تا باوکم دەنگ بەرز نەکاتەوە. ئێمە شەش خوشك بووین بەڵام برامان نەبوو. لە ناو خوشکەکانمدا من لە جوانیدا سەرتەڵ بووم، بەڵام لە جوانیدا، هیچکامێکمان هاوتای دایکم نەبوین.

لەبەختی شەڕم، ئەحمەد خان هاتە داوام. باوکم دەیویست بمدا بە ئەو. بەڵام بۆخۆم رازی نەبووم. داد و هاوار و گریانم سوودی نەبوو. قسە، قسەی باوکم بوو. ئەحمەد لە بنەماڵەی خانەکان بوو. بۆیە باوکم پێی باش بوو. هەرچەند ئەو پانزدە ساڵ لە من گەورەتر بوو. هیچیش بە دڵم نەبوو. بە شەق و لەق و زۆرکاری ناچار کرام ببمە ژنی ئەو. کەس وکاریشمان دەیان گووت: بووك بە تارای سوورەوە دەچێتە ماڵە بەخت و ئەبێ بەکفنی سپیەوە لەو ماڵە بێتە دەرێ! دایکی چارەڕەشیشم لە ترسی باوکم نەیدەوێرا لەل بڵێ. هەرچەند لە دەروونەوە بۆ من ئەسووتا. ئەحمەد، بۆ خۆشی ئەیزانی کە ئەوم ناوێت و لە ترسی باوکم شووم پێکردوە. بەڵام زۆر ئارام و بە بەزەیی بوو. وردە وردە زانیم کە من بووکی ماڵێکی گەورەم. ئاخر ئەو کات منداڵ بووم. تەنیا سێزدە ساڵم تەمەن بوو. بەڵام دەمزانی ئەحمەد چەندە خۆشی دەوێم.

ئەوە بوو کە لەگەڵی راهاتم. دواتر چووینە کرماشان و پاش چەند مانگێك دووگیان بووم. کاوەم بوو. ئێستاش بە قەد هەموو عالەم خۆشم گەرەکە. حازرم رۆژێ سەد جار لە بەری بمرم. هەرچەند ئەحمەدخان زۆری لێ نەکردووم، بەڵام لە ژیانمدا تامی ئەشقیشم نەکردوە. ژیانم هەمووی لەبەر خاتری ئەم و ئەو گوزراوە. ئەوەیە کەدەڵێم منیش قوربانییەکی دیکەی وەك سەیرانم! دەزانم بەسەزوان چی کێشاوە و لە چە دۆزەخێکدا بووە! ئەوە بوو کە پەیمانم بە خۆمدا لە سەر ئەشقی کاوە و سەیران پێداگری بکەم و نەهێڵم ئەو ئەشقە بە زایە بچێت.

ئێستا تۆ بێژە کچم! ئەی تۆ بۆچی سەیرانت خۆش دەوێت؟

ـ دایکم وادەگێڕێتەوە کە من منداڵێکی بە بەزەیی بووم و دایم حەزم کردوە یاریدەی منداڵانیتر بدەم. کاتێکیش هاتمە هەورامان، یەکەمجار سەیرانم دی، بە دژواری زامدار ببوو. ئەولە پلیکانەوە داکەوتبوو. خەریکی تیمار کردنی بووم کە هەستم بە ئازارەکانی کرد و لە بێدەنگییەکی زاڵدا کە هەیبوو توانیوم ناخی بخوێنمەوە. ئەوە بوو کە وردە وردە لێی نیزیك بوومەوە و بە هەموو ئازارەکانیم زانی. هەستم کرد، مرۆڤێك لەم بەشەی جیهاندا، پێویستی بە یاریدەدەر هەیە. بۆیە هەوڵم دا لەو دۆزەخە دەربازی بکەم. زۆری نەبرد کە زانیم ئەویش ئەتوانێ لەو غەریبییەدا هاودەمی من بێت. ئەوە بوو کە ئێمە بووینە خۆشەویستی یەکتر.

ـ باشت کردوە کچم. تۆ فریشتەی نەجاتی! ئەگەر لەم وڵاتەدا کەسانی وەك تۆ زۆر بوونایە، ئێستا ژیانمان لە دۆخێکیتردا بوو. بەڕاستی ئێرەییت پێ دەبەم کچم! بەڵام ئەزانی دێرمان کرد؟ با بگەڕێینەوە. ئێستا سەیران و خەزووری چاوەڕێن!

پاش چەند رۆژێك بنەماڵەی کاوە گەڕانەوە بۆ کرماشان. من و سەیران ماینەوە خۆمان. جاروبار سەردانی مینامان ئەکرد. جاروباریش ئەو و مێردەکەی دەهاتنە لای ئێمە. بەجاران مینا لای ئێمە دەمایەوە. شەوێك کە مینا لامان مابوویەوە، تا دەمەوبەیان لەگەڵ سەیراندا باسی سەردەمی منداڵی و کچییەتی خۆیان دەکرد. خزابوونە عالەمی خۆیانەوە و هەر ورتەیان دەهات.

رۆژێك کاتێ لە نەخۆشخانە گەڕامەوە، دیم خاوەن ماڵەکەمان لەوێیە. سنۆبەر خانم، ژنێکی لەسەرخۆ و ئارامە. چل ساڵێك تەمەنییەتی. هەرکە منی دی، هەستا بڕوات، بەڵام نەمانهێشت .

وتم: سنۆبەر خانم! ماوەیەکە لێرەین، بۆچی سەرێکمان لێ نادەیت؟

ـ بڕوا بکەن، لە رووم نایە. ئێوە دوکتورن و من ژنێکی نەخوێندەوار. باش نییە مزاحیمتان ببم.

ـ واز بێنە، ئەو قسانە چین! ئێوە خوشکی ئێمەن. تکایە ئەو قسانە مەکەن. بەتایبەت سەیران تەنیایە، جاروبار بێن بۆلای!

دەی سنۆبەرخانم! منداڵەکانت چی دەکەن! دەچنە مەدرەسە؟

ئەرێ شوکور. بەڵام ئەوە پێنج ساڵە شوەکەم مردوە. ئەم کچەم کە ناوی ستارەیە ئەوکات یەك ساڵان بوو.

ـ بەچی مرد؟

ـ پێکدادانی سەیارە.

ـ چی دەکرد؟

ـ لە کۆمپانیایەك کاری دەکرد. لێمانەوە زۆر دوور بوو. لە شاری رەفسەنجان! بۆ دابینکردنی بژێوی ئێمە ناچار بوو بڕوات بۆ ئەوێ. ئەو داماوە لەوێ کاری دەکرد و پووڵەکەی دەناردەوە بۆمان، بۆ ئێرە.

ـ راستی خانم دوکتور! سەیران خانم چیتانە! زۆر حەز دەکەم بزانم.

ـ خوشکمە.

ـ ماشەڵڵا، لە یەك ناکەن. ئەو زۆر جوانە! تووڕە مەبن، توش جوانیت، بەڵام نە وەك ئەو. چی بکەم خانم گیان! دەردی من لەوەدایە کە زۆر راستبێژم و بێ پێچ و پەنام! پێم ئەڵێن رووشکێنی!

ـ قەی ناکا. جوانییەکەی ئەو لە خوداوەیە. قابیلە هەموو مرۆڤەکان وەك یەك بن؟

ـ راستی خانم دوکتور بۆچی ئەم خوشکەتان دایم لەناوخۆی دایە! خۆ نەخۆش نییە؟

ـ نا نا، شتێك نییە. ئەو هەر وایە. حەز دەکات بێدەنگ بێت. کەمدووە!

ـ دەسگیرانی هەیە؟

ـ ئەرێ. لە تارانە. ئەوە بێتاقەتی ئەوە!

ـ ئەی خۆت چی خانم!

ـ نا جارێ. هێشتا دەخوێنم. دەرفەتی ئەوەم نییە. ئەی خۆتان چی سنۆبەر خانم!باسی ژیانی خۆتان بکەن.

ـ باسی ئەوەم دەکرد. کاتێ شوەکەم لە شیرکەت ئەگەڕایەوە تا سەردانمان بکات، دەعمی کرد و عومری بە ئێوە بەخشی و من و منداڵەکانمی بەتەنیا هێشتەوە. ئەوکات ئێمە لە کانیدینار بووین. بە لاَم کاتێ شوەکەم دەعم کرد، بیمە بوو. بە پووڵی بیمەکەی ئەم خانوەمان سەند. ئێستاش تەنیا داهاتمان ئەو کرێخانوەیە کە وەریدەگرین. کۆمپانیاکەش مانگانە شتێکمان دەداتێ.بەڵام ئەوەندە نییە. لەخودا بەزیاد بێت مەحتاج نین. خودا گەورەیە.

ـ ئافەرین سنۆبەرخانم! تۆ ژنێکی نموونەی. شێرەژنی کوردی!

ـ نا خانم دوکتور وا نییە. لە من ئازاتر و بەجەرگتر لە ناو ژنانی کورددا زۆرن. کەسانێك هەن کە تەنانەت من بە تۆزی پێشیان ناگەم. ئەوانە مامۆستای ئێمەومانان.

دووبارە ئافەرین کە ئەوەندە لە خۆبوردەیت. بەراستی تۆ شیاوی شانازیت. تۆ کەلێنی باوکیت بۆ منداڵەکانت پڕ کردوەتەوە. منداڵەکانت دەبێ شانازیت پێوە بکەن.

ـ ئەوەشم لە بیر چوو. خۆشم جاروبار کار دەکەم. بۆ ئەو خێزانانەی کە پێویستیان بە کار هەبێت. ئەوەش ئەتوانێت گۆشەیەك لە پێداویستی منداڵەکانم پڕ بکاتەوە.

ـ ئەی کەسو کارتان! لێتان ناپرسن؟

ـ مەپرسە خانم گیان!. باوکم شۆفێری کامیۆن بوو. ئێمە دوو خوشك و برایەك بووین. ژیانمان زۆر باش بوو. بەڵام رۆژێك لە جادەی مەریوان ـ سنەدا دەعمیان کرد. دایك و خوشکەکەشم لە گەل باوکمدا مردن. خوزگە منیش بمردایەم و ئەمڕۆم نەدیبایە؟

ـ ئەی ئەو رۆژە تۆ لە کوێ بووی؟

ـ من لای دایەگەورەم بووم. ئەوان هەموویان پێکەوە مردن و منیان بە تەنیا جێ هێشت.

بەوجۆرە دەرد و ئازارەکانی سنۆبەریش هاتنە سەر دەردوئازارەکانی ئێمە.

شەوێك، بە دەنگی ناڵەناڵی سەیران خەبەر بوومەوە. چوومە لای و بانگم لێکرد. لە خەو هەستا.

ـ چییە سەیران! ئەو ناڵەناڵەت لە چییە؟ خەونت دیوە؟

ـ نازانم یەلدا! سەرم زۆر دێشێ. حەبەکانم بێنە.

ـ ئازا حەبەکانم پێدا.هەستام چراکان هەڵکەم، بەڵام نەیهێشت. دەیگوت: تیشکی ئازاری چاوم دەدات.

ـ چییە سەیران! چیتە؟

ـ نازانم، خەوێکی خراپم دی.

ـ چی بوو. دادەی سەرت بخەرە سەر شانم و بۆم بگێڕەوە. ئەی ئەوە نییە هەستاوی و ئەزانی خەوت دیوە! عەیبە ئەو گریانەت لە چییە؟

ـ نازانم.خەونم بەدایکمەوە دی. لە باخەکەی ئەوکاتماندا لە تەنیشتم بوو. زۆر جوان بوو. هەروەك مانگ! دەگریا. فرمێسکەکانی منیشیان خستە گریان. نازانم چی دەویست. ئەوەندە دەزانم لە دوورەوە باوەشی ئاوەڵا کردبوو تا لە ئامێزم بگرێت. بەڵام هەستم دەکرد ئازارێکی قووڵ بە چاوانییەوە دیارە. دەیگوت: خۆشەویستم، بۆت نیگەرانم!. ئەترسم یەلدا دەترسم! نازانم دایکم بۆچی ئەوەی دەگوت؟

ـ جا چووزانم! بگرە بۆت نیگەرانە!

ـ ئاخر بۆچی؟ مەگەر چی قەوماوە؟

ـ نا شتێك نییە! هەر وا وتم.

ـ ئاخۆ بۆ ئەوە نیگەران نەبێت کە کاوە بە رێگاوەیە؟

ـ نیگەران مەبە سەیران گیان. ئیشەڵڵا بەیانی زوو ئەویش بە سلاٌمەت دەگاتێ.

ئەو شەوە سەیران خەوی لێ زڕا.تا بەیانی هەر ناڵەوهاواری بوو. بەیانی زوو، من چووم بۆ نەخۆشخانە . خۆم پێ نەدەگیرا و چەندجار تەلەفۆنم بۆ کرد و هەواڵم زانی. دەترسام دووبارە ژانەسەرەکەی سەری هەڵدابێتەوە.

سەعات چواری دوانیوەڕۆ گەڕامەوە ماڵ. کاوە گەییشتبوو. بە بینینی ئەو، زۆر خۆشحاڵ بووم. ئەو بەردەوام باسی تاران و کارەکەی خۆیی بۆ دەکردین و ئێمەش سەبارەت بە هاتنمان بۆ مەریوان و خانوو گرتن.

ـ تاسەتم کرد بوو سەیران! بڕوا بکە شەو و رۆژ ئۆقرەم نەبوو. هەمووی لە خەیاڵی تۆدا بووم. دەترسام نەخۆش بیت.

ـ نازانم بۆچی هەمیشە ترسێك دایگرتووم. وەزعم باش نییە. سەرم بەردەوام دێشێ. لەهەوراماں سەرئێشەکەم کەمتر بوو، بەڵام ئێستا زۆرتر بووە. لێرە هەست بە غەریبی دەکەم. نازانم بۆچی بەردەوام پرسیار لە خۆم دەکەم.

ـ مەترسە ئازیز. بەیانی زوو دەچینە نەخۆشخانە تا دڵنیاتر بین. ئەزانی چەندە خوشحاڵ بووم کە یەلدا کارەکەی گواستوەتەوە مەریوان؟ ئیتر دڵنیا بووم کە ئەگەر نەخۆش بن زووتر دەتوانن بگەنە بیمارستان. یەلدا! دوو حەوتەیتر چۆنە؟ ئامادەن من و سەیران زەماوەند بکەین؟

ـ نازانم کاوه، دەبێ سەیران رازی بێت. دەڵێی چی سەیران گیان،ئامادەیت؟
ـ نا جارێ ئۆقرەم نییە. دەبێ کەمێك باشتر ببمەوە.

سەیران بەردەوام لە ناوخۆیدا بوو. دایم لە داڵغەیەکدا بوو. جاروبار لەگەڵ کاوەدا هەوڵمان ئەدا کارێك بکەین کەمێك پێبکەنێت،بەڵام ئەو لە دڵەوە پێنەدەکەنی. تەنیا لەبەر دڵی من و کاوە بوو. رۆژ بەرۆژ رۆدەچوو. ئازارەکەی زیاتر دەبوو. هەستمان دەکرد شتێك ئازاری دەدات. هەرچیمان دەکرد سوودی نەبوو. دەچووینە ماڵی مینا تا لەدەوری یەکتر شاد بین،بەڵام سەیران هەروا بوو. وێڕای هەموو ئەوانەش هێشتا جوانییەکی بەردەوام بوو.هێشتاش کەس لەو جوان تر نەبوو. نە لە مەریوان و نە لە هەورامان. کاوەش رۆژبەرۆژ زیاتر ئاشقی دەبوو. دەیپەرست. هەرچی لەدەستی دەهات بۆی دەیکرد. ئەوچەند رۆژەی کە لە مەریوان بوو، چەندجار بردیە نەخۆشخانە. وەك شتێکی بیستبێ وابوو. نیگەرانی کاوەش زۆرتر ببوو.

رۆژێك لەنەخۆشخانە خەریکی کار بووم کە کاوە تەلەفۆنی کرد و وتی: دێمە نەخۆشخانە تا بتبینم. سەرم سووڕ ما. زۆری نەبرد، خانمێکی هاوکارم هاتە لام و وتی: دوکتور یەلدا، کابرایەك کاری پێتە.هەربەراست ئەوپیاوە چی دەوێ! داواکارتە؟
ـ نا گیان، ئەو قسانە چین، واز بێنە!
ـ راستم پێ بڵێ یەلدا! ئەها چەندکەڵەگەتە!
ـ واز بێنە کچێ!
ـــ هەلێکی باشە. بیگرە و بەری مەدە.پارووییەکی چەورە خانم دوکتور!
ـ باشە سوەیلا! وا دەزانی کەسێکی بەو جوانییە بە نسیبی من بێ؟
ـ لاوە توخوا! دەبێ قوڕاوخۆرەوەبێ،تۆ دوکتورێکی.
ـ واز بێنە،دەسگیراندارە!
ـ بەراستیتە؟
ـ ئەرێ. دەسگیرانی هەیە.
ـ دەسگیرانەکەی جوانە؟
ـ دەڵێی فریشتەیە! ئەتەوێ وێنەکەی ببینی؟
ـئەرێ وەڵڵا.
ـ وەرە بیبینە.
ـ وای خوایەگیان! بەڕاست ئەوە نەقاشی نییە؟

ـ نا زۆر لەوەش جوانترە.

ـ ناوی چییە؟

ـ سەیران.

ـ سەیران!

ـ ئەریٚ.

ـ کەواتە کوردە!

ـ ئەریٚ کوردێکی رەسەنە. خەڵکی هەورامانە.

ـ دیارە کچی دەوڵەمەندێك، خانێك، یان خانەدانێکە؟

ـ نا واش نییە. تازە بێوەژنیشە.کەسیشی نییە.تەنیا باوکێکی پیروپەککەوتەی هەیە.

ـ باشە ئەمانە چۆن بەیەك گەییشتوون؟

ـ ئیتر ئەوە لە چاوە سیحراویەکانی سەیران بپرسە!

ـ دیارە نووشەوموشتەی بۆ کردوە!

ـ نا خانم! ئەو زۆر لەو شتانەگەورەترە. پێویستی بەوجۆرە کارانە نییە. هەرچاوەخومارەکانی بەسە.

ـ دەزانی چییە یەلدا، خەتای تۆ نییە. خەتای ئەو دڵە خاوەن مردوەیە. ئەگینا تۆ شیاوی ئەو کوڕەی، نەك کەسێکیتر.

ـ نا سوەیلا، سەیران دەستە خوشکمە. وەك خوشکی خۆم خۆشم ئەوێت. لە دۆستیدا خەیانەت مانای نییە!

ـ باشە.لەپێشدا دەبیٚ ئەو هەقە بەخۆت بدەی دواتر بەیەکی دی.

ـ دەزانی چییە سوەیلا، ئەوەی من دەیزانم، تۆ قەد نایزانیت! تۆ سەیران ناناسیت و نازانی چۆن مرۆڤێکە؟

ـ جاریٚ واز بێنە کچیٚ! خێرا بە، بڕۆ بیهێنە ژووریٚ.

ببەخشە. نامەویٚ کاتت بگرم. دەمەویٚ شتێکت پیٚ بێژم.

ـ فەرموو کاوە. لە خزمەت دام. هەرچیم لەدەس بێت درێغی ناکەم.

ـ دەزانی چییە خانم دوکتور! کە دوێنیٚ سەیرانم بردە لای دوکتور، شتێکی گوت. نەخۆشییەکەی سەیران تەشەنەی کردوە. دەیگوت ئەوپەڕەکەی مانگێکیتر دەژییٚ!

ـ نا وانییە.شتی وانابیٚ نابیٚ؟

ـ بڕوا بکە. یەلدا خانم، بەراستمە. چی بکەین. من هیچم بە بیردا نایەت.

ـ کاوە، تۆ دەبێ ژیرانەتر بیر بکەیتەوە. نابێ شوێنی هەستەکانت بکەوی. دەبێ کارێك بکەین کە تا حەوتەیەکی تر زەماوەندەکەتان وەرێ بخەین.

نازانم، لەوکاتەوە سوەیلا ئەو باسەی کردبوو، لە دڵمدا شتێك خورپابوو. من پێشتریش هەستم کردبوو کە خۆشەویستی کاوە لە دڵم دایە، بەڵام دەمگوت ئەوە بۆ خۆشەویست بوونی سەیران دەگەڕێتەوە.

هەر بەراست! ئەوە سوەیلا چی دەگوت؟ ئەوەڵ خۆت و دواتر کەسێکی تر! نا نا لەعنەتی لێ بێت. ئەوەڵ خەڵك دوایی خۆت.ئەوە ئینسافە. ئەوە ڕەوا نییە من ئەشقی سەیران تاڵان بکەم. ئەو شەوەم بەو داڵغانەوە بەسەر برد.

وەزعی سەیران ڕۆژبەڕۆژ خراپتر دەبوو. ئەمەش بۆ من پڕئازارترین شت بوو. دایم بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ چۆن بتوانم سەیران لەو دۆخە مەرگاویە ڕزگار بکەم. ئەوەی کە دەمبینی سەیران لە بن پاڵمدا خەریکە وردە وردە لێم جیا دەبێتەوە، ئەوە زۆر تاڵ بوو.

ڕۆژێك داوای لێکردم تا پێکەوە سەرێکی هەورامان بدەین. ماوەیەك بوو کاوە گەڕابوویەوە تاران و ئێمە هەرخۆمان بووین. دەبوا من بە تەنیا توانەوەی سەیرانم بدیبایە. داواکارییەکەی سەیرانم قەبووڵ کرد و ڕۆژی هەینی بەرەو هەورامان کەوتینە ڕێ. کەمێکمان مابوو بگەینە شار، داوای لە شوفێری پاسەکە کرد تا ئێمە دابەزێنێ. ئەم کارەی سەیران بەلامەوە جێگای پرسیار بوو.

ـ سەیران دەزانی زۆرمان ماوە؟ ماندوو دەبین.

ـ ئازیزم، شوکور تۆگەنجی کێشەنییە. ئەوە منم کە نەخۆشم. وازم لێبێنە با لە دوورەوە زێدەکەم ببینم و کەمێك داخی دڵمی بەلاوە هەڵڕێژم. دڵم خەبەری داوە کە ئەمە دوایین سەفەرمە بۆ هەورامان.

ـ ئەو قسانە چین! ئەوانە لە تۆ ناوەشێنەوە. نابێ بێهیوا ببی. تۆ هێشتا گەنجی و داهاتووی باش چاوەڕێتە.

ـ نا یەلدا. من ئامادەم هەر ئەمڕۆ لەهەموان خواحافیزی بکەم.ئیتر نەداهاتوم هەیە نەهیچی دی.من گەیشتومە دوا وێستگەی ژیان. ئەبێ باروبنەم بپێچمەوە و سەفەری ئاخرم بکەم. ئەمە چارەنووسی منە.

ـ وا مەڵێ سەیران! کەواتە ئەو هەموو خەونانەی کە بۆ داهاتووی خۆت و کـاوە دەتبیـنین چییان لێدێ؟ ئەی ئەو باخە پڕ لە گوڵەی کە باست دەکرد! ئەی ئەشقە بێکۆتاییەکەی کـاوە؟ نەخێر گیانم! وا نابێ. نابێ ئەم بیرۆکە وێرانکەرانە بە مێشکتدا بێن. دەبێ ئازای گیانت هیوا بێت تا بتوانی وەك نەمامێك چرۆی خۆشەویستی دەربکەیت. نابێ خۆت بە بەزیو و هیـوابڕاو بزانی.

ـ ئاخر چۆن چۆنی یەلدا؟ تۆ کە باشتر لە من دەزانـی. ئـیتر بۆچـی وا دەڵێیـت؟ مەگـەر نازانی من تازە لە دەس چووگم؟

ـ باوەڕم نەدەکرد. بە خۆمم دەگوت: تۆ بڵێی سەیران لە نەخۆشییەکەی ئاگـادار بووبێـت؟ سەرم لێشێوا بوو.

ـ یەلدا گیان توخوا پێم بڵێ کە نامرم! بڵێ کە مـن نـە سـەرەتانم گرتـوە و نـە تۆمـۆری مێشك! دەی یەلدا وەزمان بێ! بۆچی بێدەنگی؟

زۆر نارەحەت بووم. کە زانیم سەیران ئاگاداری نەخۆشییەکەی بووە و لەمەودوا ئازارەکانی زیاتر دەبن. بۆم دەڕوانی. وەك لاڵم لێهاتبوو.

خەریك بوو لە گۆڕستانەکەی هەورامان نیزیـك دەبووینـەوە. ترسـێکی زەبـەلاح خزابـووە دڵمەوە. نەمدەزانی بۆچی؟ کارەکەم بە جۆرێك بوو کە مەرگی زۆر کەسم بەچاوی خۆم دیتبـوو و هەرگیز ئەو مەرگانەش نەیانترساندبووم. بەڵام کە ئێستا دەمبینی سەیران لە پاڵمدا خەریکە دەمرێت، ترس و دڵەخورپەیەکی سەیر خزابووە دڵمەوە.

سەیران هەروا لە پێشەوە بوو ومنیش بە دوایدا دەچووم. لە گۆشەیەکی قەبرستانەکە لایدا و وتی:

ـ یەلدا! وەرە ئێرە با قەبرەکەی دایکمت پیشان بدەم. لە پاڵ مەزارێکـدا چـۆکی هەڵـدا و هۆن هۆن گریانی دەس پێکرد. بە دەم هەنسکەوە دەیگوت:

ـ دایکە گیان! ئەی گوڵە بۆن خۆشـەکەی ژیـانم! ئـەی هـەموو کـەس و بـاوانم! هـەرگیز خۆشەویستیت لە دڵ دەرناکەم. تەنانەت لەم ماوە کورتەشدا کە لە ژیان دام. دایەگیان! ئـاخۆ دەزانی لەم رۆژانەدا میوانێکت دێ! دەزانی دایکە نازارەکەم ئەو میوانە کێیە؟ ئـەرێ، باشـت زانیوە. ئەو میوانە سەیرانەکەتە. سەیرانە جوانەکـەت. سـەیرانە چارەڕەشـەکەت! دایـەگیان! نازانم بۆچی زوو بەتەنیات هێشتم. بەڵام زۆر نابا کچە بێبەختەکەشت دێتە لات و بەیەك شـاد دەبینەوە. دایە گیان! توخوا بە چەپکێ گوڵی شـەوبۆ و مشـتێ خـاکی زێدەکەمـەوە بـێ بـۆ

پێشوازیم. دایە گیان دوعاشم بۆ بکـە بـا ئاسـان بمـرم، چـونکە گیانکەنشـت زۆر سـەخت و دژوارە. خۆت دەزانی بێژگە لە کاوە شتێکم نییە بە جێی بێڵم و خەمی بۆ بخۆم، دوعا بکە بـا لەدوای من کاوە خۆشبەخت ببێ. دایـە گیـان! تـۆ لـە نـاودڵمی. دنکەدنکـەی خـاکی سـەر گۆڕەکەت ماچ دەکەم و دەیخەمە سەرچاوانم. کێ ئێژێ ئەم خاکە نابێتە سارێژکەری ئازارەکانم!

شـیوەنی سـەیران لـە کوێسـتانەکەدا دەنگـی دەدایـەوە. فرمێسـکەکانی بەسـەر کێلـی سەرمەزارەکەی دایکیدا شۆلاوگەیان بەستبوو و. ببوونە کانییەك لە ئەشق وخۆشەویستی. بـە چڵ و پـۆپی درەختەکانەوە،چـەند جـۆر باڵنـدە و تـاق تاقکـەرە و.... ببوونـە هاوخـەمی و شیوەنیان بۆ دەسەندەوە. لقەکانی دارگوێزەکەش چـۆکیان دادابـوو. وەك بڵێـی کڕنوشـیان بـۆ دەبەن. قژە رەشەکانی وەك خەیاتەی نەرم، پەرێشانی سەرشانی ببوون. ئەوەندە نـەرم و بـەکوڵ دەگریا، جەرگی مرۆڤی دەکردە کەباب و کافر بەزەیی پێـدادەهات. منـیش بـەردەوام سـەیرم ئەکرد و بینەری ئازارەکانی بووم. لەگەڵی شیوەنم دەکرد و شەریکی خەمەکانی بووم.

ـ ئازیزەکەم! سەیران گیان! ئیتر بەسە. ئەوەندە خـۆت ئـازار مـەدە. مـەرگ و ژیـان لای خودان. تەنیا ئەو دەزانێ کێ دەمرێت و کێ دەژیت. کێ دەڵێ من بەر لـە تـۆ نـامرم. ئێمـە دەبێ سوپاسی خودا بکەین و ئامادەی دەستوورەکانی بین. نابێ خـۆت لـەدەس بـدەی. بگـرە خودای گەورە تاقیت بکاتەوە! هەستە گیان هەستە. ئەگەر لـەوە زیـاتر خـۆت ئـازار بـدەی، دایکت لێت زویر دەبێ. روحەکەی ئازار دەدەی. هەستە عەزیزم !

زۆر بەزەییم پێدا دەهاتەوە. هەرجۆر بوو هەڵم سـاند و وردەوردە بـەرەو جـادەی سـەرەکی شارەکە کەوتینە رێ. لە دەموچاوی ورد بوومەوە، هێشـتا خووسـابوو. کەوتینـە سـەرجادەی سەرەکی و چووینە ناو شار. خەڵك چاوی لێ کل نەدەکردین. ئەوانەی ئەیان ناسینەوە ئـەهاتن و رێزیان لێ دەگرتین. زۆرێك لە ژنەکان ئەهاتن و دەسـیان دەکـردە ملـی سـەیران و ماچـیان دەکرد. وردە وردە گەییشتینە بەردەرگای ماڵی باوکی سەیران. ژنە هاوسـێکەیان، کـە نـاوی شەوکەتخانم بوو، بە دەممانەوە هات و هاواری کرد: شکۆفە! شکۆفە! وەرە دەرێ! کچێ راکـە، ئەها سەیران هاتوەتەوە!

شکۆفە لە ماڵ دەرپەڕی و بە دەممانەوە هات. زۆر قەڵەو ببوو. کەڵە گەتیەکەی هەرمابوو. کراسێکی بەنەوشی کوردی لەبەر کردبوو.

ـ کچە نەخۆشەکەم زۆر بەخێر هاتیتەوە! نازانی بە هاتنەوەت چەندە خوشحالم. باوکت خەریکە دیق دەکات! ئەوە لەکوێی؟ ئای.. خانم دوکتور گیان! ئەوە تۆی؟ بەخوا کچێکی باشی. لە من و باوکی زیاتر بە هانای سەیرانەوەی!

شکۆفە بەردەوام قسەی دەکرد و هەر نەیدەبڕیەوە. تا ئەوەی کە شەوکەتی هاوسێیان، کە ژنی کەریمی قوماشی(پارچە)فرۆش بوو، لیی وەدەنگ هات و وتی: شکۆفە بەسە هێندە لێ مەلێ، خولکیان بکە با بێنە مالەوە، بەسەزوانانە حەتم ماندوون!

ـ ئەیرۆ خۆ لەبیرتان بردمەوە خولکتان بکەم! فەرموون! توخوا فەرموونە ژووریێ!

سەیران نیگایەکی پڕمانای لێگرتم. بەلام من خۆم کردە گێل تا سەیران زیاتر زویر نەبێت. ئەمجارە، بەسەرنجێکی زۆرەوە هەموو کون و قوژبنی خانوەکەیانم سەیر دەکرد. ئەو کارەش سەرنجی سەیرانی راکێشابوو.

دیواری خانوەکە، لە بەرد درووست کرابوو. بە قوڕیش مالە درابوو. بنمیچەکەی دار بوو. کە دەهاتیتە مالەوە، سەرەتا لە رێڕەوێکی تەسکدا رەد دەبووی، پاشان دەچوویتە ژوورێکی کۆن، بەلام جوان و خاوێن. دەرگاکان لە تەختە درووست کرابوون. لەو ژوورەوە دەچوویتە ژوورێکیتر کە دیار بوو تازە ساز کرابوو و گەچکاری کرابوو. لای خوارووی دیواری ژوورەکە رەنگ کرابوو. پەنجەرەیەکی چکۆلە، کە رەنگی سەوز کرابوو، بەرەو باخچەیەکی نەشمیلانە دەکرایەوە. باوکی سەیران، لە ژوورێکدا کە پێیان دەگوت" حوجرە، بە سەر نەوگێکی جوانەوە راکشابوو. دوو سەرین لە ژێر بالیدا بوون کەشکۆفە دەیوت لە پەلی کەو بۆم درووست کردوە. وێنەیەك بە دیواری ژوورەکەوە هەلواسرابوو. کە لە نیزیکەوە لیی ورد بوومەوە، زانیم وێنەی سەردەمی هەرزەکاری باوکی سەیرانە. لەولاترەوە، چەپکێ گولەباخی هەلواسرابوون. ئەوەندە هی زوو بوون کە وشك ببوون، بەلام بۆنێکی جوانیان هەبوو. رووم بەرەولای باوکی سەیران وەرچەرخاند. حالی زۆر خراپ بوو. هەستم کرد نامناسێتەوە. هێواشێ وتی: بەدەس مەینەتەکانی ئێمەوە چۆنی؟

نەخۆشییەکەی کاری خۆی کردبوو. ئەوەندە جگەرەی کێشابوو کە سییەکانی رەش ببوونەوە. دوکتورەکان وتبوویان" ئەگەر واز لە جگەرە بێنێ، لەوانەیە کۆخینەکەی کەم ببنەوە. ئەو بەردەوام دەکۆخی و بەدەس ئێشی زەنگۆل و جمگەکانییەوە ئەینالاند. سەرنجی لە من گرتبوو و چاوی لێ کل نەئەکردم. هەستم کرد شتێکی لێم ئەوێ. زانیم کە بێژگە لە چاودێریکردنی سەیران نییە. ئەو بە ئازارەکەی سەیرانی ئەزانی، بەلام شتێکی پێ نەئەکرا.

بەسەزوان خۆشی لە جێگادا بوو و نەیئەتوانی بجوولێتەوە. سەیران بۆ گوڵی نێـو گوڵدانەکـەی ئەڕوانی و هیچی نەئەوت. باوکی زۆری لە خۆی کرد تا تـوانی لـە سـەیران نیزیـك ببێتـەوە. هەرجۆر بوو دەستی سەیرانی گرت و ماچی کرد. سەیرانیش، خۆی بۆ نـەگیرا، دەسـتی کـردە ملی باوکی و ئەم لاوئەولای ماچ کرد. بینینی ئەو دیمەنە دڵی بەردی دەکردە ئاو. ئەوەندە بـە حەژمەتەوە یەکیان لە باوەش گرتبوو کە باس ناکرێت. ئەوە نزیکەی سـێ مـانگ دەبـوو کـە سەیران و باوکی یەکتریان نەدیبوو. ئەوان هەربـەوجۆرە، بـۆ ماوەیـەکی زۆر مانـەوە و باسـی رابردویان دەکرد. ئاخرەکەی باوکی سەیران،داوای لە شکۆفە کرد تـا خـواردنێکی باشمـان بـۆ ئامادە بکات. بەڵام ئەو هەروا دانیشتبوو و لەبەر خۆیەوە بۆڵەی دەهات.

ئاخری باوکی سەیران دووبارە وتی: ئافرەت هەستە، درەنگ(دێرە). شـتێکیان بـۆ ئامـادە بکە. شکۆفە هەستا و چوو. راستییەکەی زۆرم برسی بوو. دوعام دەکرد تا خواردنەکـە زووتـر حازر ببێت. سەیرانیش هەستایەوە و چوو تا جلـەکانی بگۆڕێـت و ئاوێـك بـە دەم و چـاویەوە بدات. لە پاڵ حەوزێکی کۆندا دانیشتبوو. ئاوەکە دڵۆپ دڵۆپ دەڕژایە ناوی. بانگی لە منیش کرد تا بچمە لای.

ـ سەیران، لەپاڵ ئـەم حـەوزەدا و هـەر ئێسـتاکە بـۆنی دایکـم دەکـەم. هەسـت دەکـەم لەبەرچاومە.

ـ باشە چۆنە؟

ـ جوان! زۆرجـوان! هـەروەك خەرمانـەی خـۆر. دڵـی هـەروەك ئەوسـا کـەیلی عەشـق و خۆشەویستیە...... ئای یەلدا! نازانی بێدایکی چەندە سەختە. کەسێك ئـەو ژانـە نەچـێژێت، نایزانێ. بەتایبەت ئەگەر کەسێکیش شك نەبەیت کە پشتی پێ ببەستی و بتوانێ کەمێك لـە جێگای خاڵیی ئەوت بۆ پڕ بکاتەوە. ئای...

بیسـتنی ئــەو باســانە، بەلامــەوە ســەخت و دژوار بــوون. فرمێســکەکانی دووبــارە خرۆشابوونەوە. لەو کاتەدا هەستم ئـەکرد تـەنیا مـن و حەوزەکـە و ئـەو دارتـوە پـیرەی کـە لەقوپۆپی رەزەکانی لێ ئالأبوون ئاگاداری ئەو دۆخەی سەیرانین.

لەپڕ باوەژنی هاواری کرد: ئەوە چیتانە کچەکان! بێنە ژوورەوە. هەوا تـاریکی کـرد. خـۆ قابیلە ئێمە غەریبە بین!

وتم: ئای ...سەیران ، بە دەس ئەم ژنەوە! چەندە فرە رێسە!

ـ یەلدا گیان! لە هیچ تێنەگەییشتوە. هەروەك ئەوسا بیر دەكاتەوە. بڕوا بكە زۆر بەدبەختە، دڵێكی پاكی هەیە! بەڵام نازانێ چۆنچۆنی هەڵسوكەوت بكات. هەر ئەوەش بوو كە منیشی وێڕس كردبوو. تكایە بە دڵی مەگرە!

ـ نا گیانەكەم! ئەو قسانە چین؟ كەی من لە بنەماڵەی تۆ شتێك بە دڵ دەگرم. منیش هەروەك تۆ خۆم بە بەشێك لەم بنەماڵەیە دەزانم.

خوا هەڵناگرێ، شكۆفە خواردنێكی باش و بەلەزتی ئامادە كردبوو. یاپراخێكی جوان و بەلەزەت. تا ئێستا خواردنی وەهام نەخواردبوو. بەسەر سفرەكەوە، نانی ساجی هەورامان و دۆی تازەشی دانابوو كە لە ماستی شیری بزن ئامادەی كردبوو. بەڵام من هەر خەریكی ورد بوونەوەی نیگاكانی سەیران و باوكی بووم كە چۆن بە تاسەوە بۆ یەكیان دەڕوانی و بە تیشكی نیگاكانیان هەزاران داستانی زوویان دەگەڕاندەوە.

پاش خواردنەكە، دووبارە سەیران و باوكی دەستیان كرد بە گەڕاندنەوەی بیرەوەرییەكانیان. باوكی زۆر داستانی بۆ دەگەڕاندەوە و باسی دایكی سەیران وسەردەمی منداڵیی سەیرانی ئەكرد. هەستم كرد ، سەیران بەبیستنی ئەو داستان و بەسەرهاتانە، خەریكە هێور دەبێتەوە.

بۆ بەیانییەكەی بڕیارمان دا " من و سەیران و باوەژنی، بڕۆین بۆ كوێستانەكانی بەرانبەری هەورامان. بۆ نێو باخەكانی بەنەن ودەرەویان. باوكی هەوڵی زۆریدا سەیران لەو بڕیارە پاشگەز بكاتەوە، بەڵام سوودی نەبوو. منیش داوام لە باوكی كرد واز بێنێت تا ئەو ئارەزوەی سەیران بەدی بێنین. چونكە دەمێك بوو ئەو ئاواتەی لەدڵدا بوو. دەمزانی سەیران حەز دەكات لەوێ كەباب بكەین. بۆیە دوو كیلۆ گۆشتمان سەند و كەوتینە ڕێ. دووربینەكەشم لەگەڵ خۆم برد تا بڕێك فیلم هەڵبگرم.

نیزیكەی سەعات نۆی سەرلەبەیانی كەوتینە ری. هەستم بە ڕۆژێكی خۆش دەكرد. ڕێگاكە دوور بوو، بەڵام هەرجۆر بوو گەییشتین. كوێستانێكی بەرز و خەملیو، ئاووهەوایەكی سازگار،باخ‌وباخاتێكی رازاوە و جوان....، بەسەر لووتكە بەرزەكەوە هێشتا بەفر مابوو، بەڵام لە ئێمەوە زۆر دوورتر بوو. دەنگم هەڵبڕی و بە گۆرانییەك بێدەنگییەكەم شكاند، دەمزانی ئەوە حەزی سەیرانە. سەیران ئەو رۆژە زۆر خۆشحاڵ بوو. لەخۆشیان وەخت بوو بفڕێ. منیش شتێكم لە ئەو كەمتر نەبوو.شكۆفە، گوێچكەی قورس بوو. دایم لەبەر خۆیەیەوە بۆڵەی دەهات. كەس نەیئەزانی لەگەڵ كێیەتی. خەریك بوو هۆگری دەبووم. نازانم، بگرە خەتای كاریگەری نانونمەكی دەستی بووبێت! ئەوە بوو كە ویستم كەمێك لای بەلاوە بكەم و بیدوێنم.

ـ شکۆفە، شکۆفە خانم!

ـ چییە! چیت گەرەکە خانم! ئەو جلانە کەی هی کوێستانن! بینە دەستت، وابزانم ماندوو بووی. یان خەمی سەیرانتە؟ وازی لێ بێنە، ئەو تاقانەی باوکیەتی!

ـ نا، وانییە!من رەحەتم. سەیرانیش ئەوینداری کوێستانە، لێرە هەرگیز ماندوو نابێت!

ـ ئەی چییە؟

ـ ئەمەوێ کەمێك باسی خۆتم بۆ بکەیت! ژیانت، بیرەوەرییەکانت، ئازارەکانت!

ـ بۆچی منیش مرۆڤم کە باسێکم هەبێ؟

ـ بۆچی نا! تۆ خانمێکی ئازا و بە جەرگی.

ـ واز بێنە! پاش پەنجا ساڵ ئەوە یەکەم کەسە کە تاریفم لێبکات!

ـ بۆچی چیتە؟ ئەو هەموو ماوەیە دەتناسم، هیچ خرابەیەکم پێوە نەدیوی!

ـ یەلدا خانم درۆ مەکە! من خراپ پەروەدە کراوم و بێجگە لە خراپە هیچیتر نازانم.

ـ شتی وا چۆن دەبێ؟

ـ من بووم و شەش خوشکی بچووکتر لە خۆم. باوکمان مرد. دایکم ژنێکی زەحمەتکێش و مەینەتیی و بەبەزەیی بوو. شەوورۆژی دەنا بەسەر یەکەوە تا ئێمە برسی نەبین. شەوانە، لە تاو ئێشی دەست ولاقی خەوی پیا نەدەکەوت. من سێزدەسالان بووم. تەنیا ژوورێکمان هەبوو. دایکم نەخۆش کەوت و زەمینگیر بوو. بەناچار بوومە کارەکەری ماڵە خان! تا تیکە نانێك بۆ خوشکەکانم پەیدا بکەم. نازانی چە زەجرێکیان دەدام و چیم دەکێشا؟ بە تایبەت منداڵەکانی گاڵتەی زۆریان پێئەکردم. هەژاری ناچاری کردبووم دان بەخۆدا بگرم و وسکتم لە دەم نەیەت. زۆری نەبرد، دایکم لەوپەڕی هەژاری و دەسکورتیدا مرد. من مامەوەو خوشکەکانم. شەووڕۆژ هەوڵم دەدا تا بتوانم ژیانیان دابین بکەم. بە هەر کولەمەرگیەك بوو هەموویانم گەورە کرد و بە شووم دان. ئەوان هەموویان جوان بوون بێجگە لە خۆم کەکەس ئاوری لێ نەئەدامەوە. ژیانی کچێکی سێزدە ساڵان، بوو بە ژیانی قەیرەیەکی لە هەموو لا دابڕاو. ماوەیەکی زۆر بە تەنیا مامەوە. کەچی هیچییەك لە خوشکەکانم ئاورێکیشیان لێ نەئەدامەوە. نازانی بە تەنیا چیم دەچەشت. تەنیا هاوەڵ و هاودەمم دارودیواری ژوورەکەم بوون. تا ئەوەی فەرەج هاتە خوازگێنیم. ئەویش پیاوێکی زۆر فەقیر و دەسکورت بوو. تازە ژنەکەی مردبوو. و کچێکی منداڵی بە جێ هێشتبوو. باوەڕ بکە من دڵم مردبوو. نە فەرەجم خۆش دەویست و نە هیچ پیاوێکی دیکە. ئەو پیر ببوو ومنیش بیست و نۆ ساڵان بووم. بە ناچاری و لەبەر تەنیایی و

بێکەسی شووم پێکرد. دەزانی ئەو شوو کردنەم چەندە هەڵە بوو. کەسێك هیچ خۆشت نەویٚ ئەو هەموو فیداکارییە کە دەرهەق بە خوشکەکانم کردبووم تەمیٚی کردبووم. ئیدی نەمدەویست سەبارەت بە کەسێکی تر دووبارەی بکەمەوە. تەنانەت کچەکەی فەرەجیش! ئەوە بوو کە تەنانەت رقم لە منداڵیش بوو و ئەو هەموو ماوەیە کە ژنی فەرەجم، نەمهێشتوە منداڵم ببیٚ! بە درۆ وتوومە کە من بە شێوەی سروشتی منداڵم نابیٚ. جا وەرە و لێکی بدەرەوە! کەسێك تەنانەت لە منداڵی خۆشی بێزار بێت، چۆن دەتوانی منداڵی کەسێکی تر بلاوێنێت و موحیبەتی پێبکات! ئەمە ناکریٚ! ئەوە بوو کە رقم لە سەیران بوو. گەرەکم بوو تۆڵەی منداڵیی خوشکەکانم لەئەو بکەمەوە. بە تایبەت کە ئەویش زۆر جوان بوو و ئەوەندەیتر منی تووڕە دەکرد. بویە زۆربەی کاتەکان ئازارم دەدا. تەنانەت لەوەش رقم بوو کە هەستم دەکرد باوکی کەمێك لە سەرنجی خۆی بە ئەو دەبەخشێت. ئەوە بوو کە گەرەکم بوو هەرجۆر بۆم بکریٚ لە ژیانی خۆم دووری بخەمەوە. جا بە قسمەتی کیٚ دەبیٚ و داهاتووی چی دەبیٚ، کەیفی خۆیەتی. بەڵام راستت پێبڵێم، ئێستا کە دەبینم ئاوەها نەخۆشە هەست بە پەشیمانی ئەکەم. هەست بە گوناح و تاوان دەکەم. هەرچەند باوکی لێمی ئەشارێتەوە، بەڵام خۆم دەزانم چییەتی! راستە ئەوەندەش ناقۆڵا و تووڕەم، بەڵام لە ناخەوە زۆر بە بەزەییم...

چاوەکانی پڕ ببوون لە فرمێسك. دەمزانی کە هیچ دڵێك لە ئەشق و خۆشەویستی خاڵی نییە. سەیران لەدوامانەوە بوو. وردە وردە ڕێگاکەمان بڕی و گەییشتینە ئەو شوێنەی کە مەبەستمان بوو. نازانم چۆن وەسفی جوانییەکانی بکەم. سەیران بەردەوام خەریك بوو سەیری کەژوکێوەکانی دەکرد. بۆ تاوێکیش چاوی لە جوانییەکان کل نەدەکرد. بڕیٚ داری کۆ کردەوە و ئاورێکی کردەوە و لە پاڵیدا دانیشت. چوومە لای. چاوەکانی بە قووڵاییدا چووبوون. هەستم کرد روحی لای خۆی نەماوە و بیرەکانی لە شوێنێکی ترن. بانگم لێکرد. نەیبیست. دووبارە بانگم کرد. داچڵەکا و گوتی:

ـ وەی خوایەگیان! سەیران ئەوە لە کەیەوە لەلامی؟ باوەڕ بکە هەر نەشم زانیوە.

ـ قەی ناکا. خەتای من بوو . خەڵوەتەکەم تێك دای! راستیی لە کویٚ بووی؟

ـ راستەکەی لەبیری کاوەدا بووم. ئەموت زۆر خۆش دەبوو ئەگەر کاوەشمان لەگەڵ بوایە.

ـ کات زۆرە، خەمت نەبیٚ. ئیشەڵلا دوای زەماوەندەکەتان بێن بۆ ئێرە.

ـ جا کیٚ ئەڵیٚ زەماوەندێك لەکاردا دەبیٚ؟

ـ دووباره دەستت پێکردەوە! لە بێهیواییدا هیوایەك هەیە. بۆچی مەگەر دوای هەر شەوێکی تارێك، ڕۆژێکی ڕووناك هەڵنایە؟!

ـ نا یەلدا! دڵنیام بەمزوانە دەمرم و ئیتر ناتوانم زێدەکەم ببینمەوە!

ـ نا، وانییە واز بێنە سەیران، دەس پێ مەکەرەوە! ئاخ ئەمزانی بۆچی ئەوەندە باسی بێهیوایی خۆت دەکەیت؟ ئەی بۆچی باسی ئەوە ناکەیت کە بەمزوانە شوو دەکەیت، منداڵت دەبێت!...

ـ نا یەلدا! من باسی خەون و خەیاڵ ناکەم!

ـ باشە واز بێنە!

ـ من داوایەکم لێت هەیە یەلدا گیان!

ـ چییە ئازیزم!

ـ یەلدا گیان! ئەو هەموە چاکەت لەگەڵ کردووم. وەرە چاکەیەکی دیکەشم لەگەڵ بکە!

ـ چیت ئەوێ! هەرچیم پێبکرێ، دریغی ناکەم.

ـ یەلدا گیان! کە مردم، جەنازەکەم بێنەوە هەورامان و لێرە بمنێژە. لە پاڵ دایکمدا هەست بە حەسانەوەی زیاتر دەکەم. تکات لێدەکەم وا بکە.

ـ تۆ بیت و خوا واز بێنە سەیران! هاتووین کەمێك خۆشمان بێت، لێمان تێك مەدە. نەهاتباین باشتر نەبوو؟

ـ بمبەخشە یەلدا گیان! نەمویست زویرت بکەم!

ـ هەستە با بڕۆینە لای شکۆفە، ئەها چ ئاگرێکی کردوەتەوە وخەریکی دەم کردنی چاییە!

دووکەڵی ئاگرەکە، ئەو ناوەی داگرتبوو. لە تاو تینی ئاگرەکە سەوزە و گوڵەکانی دەور و بەری ئاورگەکە، داخ دەبوون و هەڵدەپڕووزان. شکۆفە، خەریکی ئامادە کردنی کەباب بوو. منیش لە نیزیك ئاورەکەوە دانیشتبووم و لەولاترەوە سەیران سفرەکەی ڕائەخست. نانێکی باشمان خوارد. تامەکەی، پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵ، هێشتا لە دەممدایە. پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ، بە داوێنی کوێستانەکەدا کەوتینە گەڕان. نازانم بۆچی هەرگیز ئەو ڕۆژە لەیاد ناکەم. سەیران، لە نیزیك برێ گوڵەوە ڕاکشابوو و ئاسمانی سەیری دەکرد. شکۆفەش خەریك بوو بەسەر کانیاوێکەوە دەسنوێژی دەگرت. سەیران هەروا چاوی بڕیبووە ئاسمان و قسەی زۆر خۆشی دەکرد. منیش لە پاڵیدا گوێم بۆگرتبوو. وام ئەزانی لایلایەم بۆ دەکات. دەنگە زۆلاڵەکەی ئێستاش لە گوێم دایە:

ـ بڕوانە یەلدا! ئاسمان چەندەجوانە! شین و بەرین. پەڕاوپەڕی ناکرێت. ئـەها بڕوانـە، خـۆر خەریکە چاوبرکێم لەگەڵ ئەکات. ئەها! پێئەکەنێ. گوڵەکانیش بە فـەرمانی ئـەو پێدەکـەنن. ئەو کانیاوەش،لە ناخی زەویەوە هەڵدەقوڵێت و فەڕ و بەرەکەت دەبەخشێ. هەر دڵۆپە ئاوێکی مانایەکی تایبەتی هەیە. تاشەبەردەکەی پاڵی پێی دەڵێت: تۆ چەندە جوان و خـاوێنی. بـەڵام من لێرە بە تەنیام و بێهاودەم، تەنیا وەك پاسەوانێك بەدیارتەوەم. تۆ ئازادی، بە جۆگەکـەدا دەکشێیت و دەڕۆیت.کەس نییە بتخاتە بەر پرسیار. جـارێکیش خولْکـت نـەکردم کـە ئـاخۆ لەگەڵت دێم؟

کانیاوەکەش وەڵامی دەداتەوە: ئەوە چارەنووسی تۆیە. دەبێ پاسەوانیی من بکەیت.چونکە من جوان و خـۆشویسـتراوم. تـۆش دەتـوانی لـە بێـدەنگی بەردەوامـدا بیـت، یـان ئـەوەتا بێدەنگییەکە بشکێنیت و خۆت بەدەریا بگەیەنی.

ئەها! ئەو دارگوێزە پیرەش لەگەل ئەو دارهەنارەدا گفتوگۆ ئەکات. دارهەنارەکە خەریکـە ناز دەکات و دەڵێت: سەمەری من جوان و شیرینە. من دەبمە میوانی شـەوانی یەلـدا. منیـان خۆش دەوێت. دارگوێزەکەش وەڵامی دەداتەوە: هەر بڵێ و بەخۆت بنازە! ئەی باشە ترشیەکەت چی لێدەکەی؟ تۆ لە نیزکمەوەی و باشت دەناسـم. پێویسـت ناکـات ئەوەنـدە تـاریفی خـۆت بکەیت!

دارهەنارەکەش وەڵام دەداتەوە: نـا، تـۆ دایـم گەرەکتـە عەیبـدارم بکـەیت. بۆختـانم بـۆ دادەتاشی. ئەی بۆ موویەك لە چاوی خۆتدا نابینی، ئەی دارگوێزی پیری لەق و پـۆپ شـکاو! دارگوێزەکەش دەڵێت: ئەگەر ئەبینی ئاوەها تێكشـکاوم، بـەڵام ئەسـتوورتر لـەجاران ریشـەم داکوتاوە و پشتم بەکەس نەبەستوە. ئەی نابینی چەندە بە ئیرادەم؟ هێشتاش شانازی بەو لەقە لارولوێرانەوە دەکەم!

دارهەنارەکە لە دڵی خۆیەوە ئافەرینی بۆ دەنێرێ وسوپاسی خۆڕاگری ئەو پیرەدارە دەکات.

ـ وای خۆایەگیان! سەیران! راست دەکەیت ئەها چۆن تاریفی خۆی دەکـات! باشـە سـەیران گیان! ئەوە تۆ ئەو هەموە جوان و بە بەژن نیت؟ وەك هـەنار جـوان و بـەتامی! وەك ئـەو دارە سەربەرزی! لەو کانیاوەش خاوێنتر و بەفەڕتری! ئەوەت لە یاد نەچێت!

نەمزانی مەبەستی سەیران لەو باسانە چی بوو؟ ئاخۆ ناڵاندن بەدەس چارەنووسـی خۆیـەوە نەبوو؟ یان پەلاماردانی ژیانی پڕلە تاڵەوسۆڵەی ژیانی نەبوو؟

سەیران، لە کوێستان و کانیاو و باخ و باخات و جوانییەکانی خواحافیزی کرد. ماچی زۆری بۆ دەناردن. بۆ هەر کون و قوژبنێك، بۆ هەرگوڵ و چڵە گیایەك. تا ئەوەی دەمەو ڕۆژاوا گەییشتینەوە شار. زۆرماندوو. سەیران ئەوەندە ماندوو بوو، خێراچووە ناو جێگاکەی باوکی و خەو بردیەوە. شکۆفەش خەریکی کاروفرمان بوو. منیش وردەوردە خەو بردمیەوە.

بەیانییەکەی بڕیارمان دا بگەڕێنەوە بۆ مەریوان. ئیجازەکەی من تەواو ببوو و ئیتر ناچار بەگەڕانەوە بووین. باوکی سەیران، بەو بڕیارەی ئێمە زۆر ناڕەحەت و خەمبار بوو. بەڵێنم پێدا هەرکە سەیران کەمێك باشتر بوو، دووبارە سەردانیان بکەینەوە. بەڵام سەیران بە روانینەکانی پێی دەگوتم کە ئەوە نەلواوە! سعات دووی دوانیوەڕۆ گەییشتینەوە مەریوان. خێرا چوومە بیمارستان و بڕێ کارم بوو ئەنجامم دان. کاوە تەلەفۆنی کرد. تووڕەو و ناڕەحەت بوو. پرسیم:

ـ کاوە! ئەوە چییە؟ شتێك رووی داوە؟

ـ ئەوە چەند رۆژە تەلەفۆن دەکەم، تۆ لەکوێی؟ باوەڕ بکە ئەمڕۆ گەرەکم بوو خۆم بگەیەنمە مەریوان! زۆر ترساوم یەلدا! توخوا هیچ نەقەوماوە؟

ـ ناڕەحەت مەبە. سەیران زۆر بێتاقەت بوو. چووین سەردانێکی هەورامانمان کرد.

ـ باشە ئەی بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە!

ـ وتیان بە شوێن کاردا چووگی و لەوێ نیت! نەشمان دەزانی ئەوەندەمان پێ‌دەچێت.

ـ ئەی ئێستا! سەیران چۆنە! لەهەورامان هیچ رووی نەدا؟

ـ نا. بێخەم بە.

ـ توخوا یەلدا خانم! تۆش دەزانی سەیران دەبێ لەژێر چاوەدێری پزیشکدا بێت؟

ـ راستە. بەڵام ئەوە داخوازیی سەیران بوو.بڕوا بکە منیش ناچار بووم لەگەڵی بڕۆم. ئەگینا ئێستا دەرفەتی سەفەرم نەبوو. کارەکانم بە جێ هێشت و لەگەڵی چووم. تۆش ئاوا دەڵێی!

ـ ببوورە یەلدا خانم! بەدەسی خۆم نییە! توخوا زویر مەبە. من جۆرێکیتر سەیری تۆ دەکەم.

ـ نا ، گرنگ نییە! کارێکت نییە؟

ـ نا.تەنیا بە سەیران بێژە کە بەیانی زوو بەرەو مەریوان دەکەومە رێ.

ـ باشە ئاگاداری خۆت بە، قوربان!

ـ نازانم بۆچی ئاوەها تووڕە بووم. خۆم دەمزانی کاوە نیگەرانی سەیرانە؟ ئاخۆ ئێرەیی بردن نەبووبێ؟ یان بگرەماندوویەتی بێتاقەتی کردبێتم! لەمکاتەدا سوەیلا وەژوورت کەوت!

ـ سڵاو دوکتور! بێ وەفا دۆستایەتی ئاوەها دەبێت؟ ئەوە لەکوێی کچێ! چەند رۆژە رۆیشتووی. هەموو ئەرکەکانت خستوەتە سەرشانی من و خۆت لە هەورامان خەریکی گەشت و گوزاری! راستم پێ بێژە لە کوێ بووگی؟

ـ بۆخۆت باشتر دەزانی! ئەی بۆچی پێم نەوتی گەرەکمە سەردانێکی هەورامان بکەم!

ـ کەواتە لەوێ بووی؟ ئەرێ باشە خۆ باشت رابواردوە؟

ـ خراپ نەبوو. جێگاتان سەوز! جێگات بەتاڵ بوو بەڵام سەوز (ئیدیۆمێکی فارسییە)

ـ ئەوە چییە یەلدا؟ لە شتێك نارەحەتی؟

ـ نا. شتێك نییە،تەنیا کەمێك ماندووم.

ـ بۆ درۆ دەکەی کچێ! چاوت درۆیان لێ ئەبارێ! شتێك رووی داوە یەلدا؟ سەیران چی بەسەر هاتوە؟

ـ حاڵی باشە!

ـ ئەی کاوە؟

ـ هەر ئێستا تەلەفۆنەکەی داخست!

ـ کەواتە بۆ ئەو نیگەرانی!

ـ نا. وا نییە!

ـ وایە ئیتر. برێکەس لە بەختی خۆیان رادەکەن و ئێمەش لەم شارەدا غەریب و تەنیا. نە شوێك! نە دەسگیرانێك! ...

ـ واز بێنە سوەیلا! تاقەتی سوعبەتم نییە.

ـ راستی دڵی شکاندووی؟ یان ئێرەیی بە سەیران دەبەی؟ کامیانە خانم!

ـ نازانم، لە لایەکەوە هەقت پێدەدەم و لەولاشەوە هەست دەکەم ئەو بیرانە خیانەتن بە سەیران!

ـ باشە کێ وتوویە تۆ هەر ئێستاکە کاوە لە سەیران بسێنی؟

ـ تکایە سوەیلا! سەبارەت بە سەیران شتێك مەڵێ. ئەو باشترین هەڤاڵی منە!

ـ راستی یەلدا، قسەی خۆمان بێ، ئەگەر سەیران نەبوایا، حەزت نەدەکرد کاوە لەگەڵ تۆ بوایە؟

ـ بگره ئەو منی نەویستایە؟

ـ حەدی چییە خانمێکی وەك تۆی هەبوایێ. جوان و شەنگ و شۆخ نیت؟ تارانی نیت؟ دوکتور نیت؟ بالآت بەرز نییە؟ چی...؟!

ـ سوەیلا! ئەوە تۆ سەیرانت نەدیوە؟ ئەگینا ئەو قسە قۆڕانەت نەدەکرد!

ـ کەواتە ئەمڕۆ بمبە با بیبینم. هەرچەند ئەگەر شا جوانی هەموو دونیاش بێت، تازە ئەو دەڕوات. تۆ نابێ بهێڵی کاوەت لە دەس دەربچێت. ئەگینا خەڵکی دیکە دەیرفێنن! تا ئێستا من پیاوی وەهام نەدیوە؟

ـ تکایە سوەیلا! واز لە سەیران بێنە؟ وەك خوشکی خۆم خۆشم دەوێ. ئەو تاقە خوشکی منە.

ـ هەموو ئەوانە دەزانم. بەڵام بیر لە خۆشت بکەوە! بیر لە داهاتووت بکەوە!

ـ نا سوەیلا! ئەو شتانە لای من بایەخیان نییە، وازم لێ بێنە، تکایە!

ـ بەڵام یەلدا! چاوەکانت شتێکیتر دەدرکێنن! تۆ خەریکی خۆت دەکەیتە قوربانی. من زۆر شت دەزانم.

ـ ڕەنگە وابێ! دەبێ ئەوەی لە دڵمدایە بۆتی باس بکەم. تا ئێستا سفرەی دڵم لای کەس نەکردوەتەوە! بەڵام من دۆستی سەیرانم! خوا هەڵناگرێ!

ـ ڕەحەت بە. کەمێك بیر لە داهاتووش بکەوە. ئەها خەریکە پشووت سوار ئەبێ؟

ـ دەزانی چییە سوەیلا! لەوکاتەوە کاوەم دیوە چەقیوەتە دڵم. ئارامم لا نەماوە. ئەم بابەتە تەواو ئازارم دەدات. چونکە سەیران دۆستی منە. ویژدانم عەزابم دەدات. زۆر ئێرەیی بە سەیران دەبەم. من بە بۆنەی سەیرانەوە کاوەم ناسی، بەڵام هەست دەکەم ئێستا مانەوەم لە پاڵ سەیراندا تەنیا لەبەر کاوەیە. زیاتر لە سەیران ئاشقی کاوە بووگم. تێدەگەی سوەیلا؟

ـ دەزانم. ڕاستە. ئەشق هیچ سنوورێك ناناسێت!هیچ یاسایەك ناتوانێ پاوانی بکات! دۆستایەتی تۆ و سەیرانیش ناتوانێ بەرگری لە کلپەی ئەو خۆشەویستیە بکات! تۆ دەبێ هەوڵ بدەی خۆت بیت و خۆت بدۆزیتەوە. لەپێشدا خۆت، پاشان خەڵکی دیکە! ئەی باشە یەلدا! هەڵسوکەوتی ئەو چۆنە؟

ـ ئاساییە. ئەو تەنیا ئاشقی سەیرانە و بەس. ئەگەر حەز دەکەی بەچاوی خۆت بیبینی، دوور نییە! وەرە ببینە!

ـ لەگەڵ سوەیلا بەرەو ماڵەوە چووین. سەعات سێی دوانیوەڕۆ گەییشتن. سەیران بە تـەنیا دانیشتبوو. بە بینینی ئێمە خوشحاڵ بوو وبەپیریمانەوە هات!

سوەیلام پێ ناساند. سەرنجی سوەیلام دەدا کە چۆن بـە سـەیراندا واق ببـوو و چـاوی لـێ هەڵنەدەگرت. بۆیە وتم:

ـ ئەوە شتێك رووی داوە سوەیلا؟ چییە دەڵێی کارەبا گرتووتی؟!

ـ دەمی ببوە تەڵەی تەقیو. سەیران سەرسامی کردبوو. بەتایبەت کەزۆر لەسەرخۆ و رێـك و پێك میوانداری دەکرد. کراسێکی کوردی مۆری زۆر جـوانی لەبـەردا بـوو قـژە رەشـەکانی بەسەرشانیدا بەردابۆوە و خشپەخشپ خۆی بە کاری نانی شێوانەوە خەریك کردبوو.

ب ـ هێواشی وتم: دەی سوەیلا! ئێستا دەڵێی چی؟

ـ بەڕاستی جوانە! ئەوەیە کە کاوەی شێت کردوە! ئەم کچە شای جوانییە!بڕوا بکە یەلـدا، تا ئێستا شتی وەهام نەدیوە. ئەوە چۆن چۆنی یەکیان دۆزیوەتەوە؟

ئەوە بەسەرهاتەکەی دوور و و درێژە. دەبێ کاتی خۆی بۆتی باس بکەم.

هەڵسوکەوتی سەیران، دڵی سوەیلای بردبوو. هەرچی زۆرتر قسەیان دەکرد زیاتر لـە یـەك نیزیك دەبوونەوە. سەیران خواردنێکی زۆر بەتامی ئامادە کردبوو. دوای نانخواردن، بەرانبـەر بە سوەیلا دانیشت و پێکەوە گەرمی قسە بوون. سەیران، باسـی ژیـانی خـۆی دەگێڕایـەوە و سوەیلاش بەگیان و دڵ گوێی راگرتبوو. دیار بوو کاریگـەری زۆری لـە سـەری دانـابوو، بۆیـە بەردەوام هەوڵی دەدا فرمێسکەکانی لە من بشارێتەوە.

ئەو شەوە، سەیران نەیهێشت سوەیلا بڕواتەوە و پێکەوە نووسـتین. تـا درەنگانێـك ئـەوان نەخەوتن وبەردەوام قسەیان دەکرد.

بەیانییەکەی، بەر چایان خوارد و بەرەو بیمارستان بەڕێ کەوتین تا بچینە سـەرکارەکانمان. ئەو رۆژە هەوڵم ئەدا بزانم سیوەیلا چۆن بیرلە سـەیران دەکاتـەوە! هەرچـەند دەمزانـی، بـەڵام هەوڵم دەدا ئەوە لە دەمی خۆیەوە ببیستم. ئەو بەردەوام دەیگوت: هیچ. تەنیا هەست دەکـەم دووچاری عەزابی ویژدان بووم.

وتم: بۆچی؟ مەگەر چی گۆڕاوە؟

ـ دەزانی چییە یەلدا! تا ئێستا کەسـێك بـەوجۆرە کاریگـەری لەسـەر هەسـتەکانی مـن نەبووە. ئێستا دەزانم ئەو ئافرەتە کێیە و چی کێشاوە؟ ئێستا هەست بە ئازارەکانی ئـەو دڵـە

ناسکەی دەکەم و بۆی بە پەرۆشم. دەزانی چی لە دڵدایە! یەلدا گیان! بڕوا بکە لە قسەکانم پەشیمانم.

ـ تێدەگەم سوەیلا! خۆت، لەخۆت ببوورە تا خواش لێت خۆش بێت. دەبێ یاریدەی سەیران بدەین تا بەشکەم چاك ببێتەوە. ئەو پێویستی بە ئێمەیە.

ـ جا چۆن!

ـ دەبێ تا زووە زەماوەندەکەی بخەینە ڕێ. ئەمڕۆ کاوە دێتەوە. دەبێ هەوڵ بدەین لانیکەم ئەو ئاواتەی بێتە دی.

سەعات پێنجی دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە، کاوە گەییشت.سەیران بە بینینی ئەو زۆر شادمان بوو.کاوەش هەروا.

ـ ئازیزەکەم، دەترسم نەمێنم تا بتوانم لەپاڵتدا بژیم. لەوە دەترسم نەتوانم لە ژێر سێبەرتدا بحەسێمەوە.

ـ هیوادار بە. دڵنیا بە چاك دەبیتەوە. من کەدڵنیام.

ـ بە تەنیام هێشتن تا بۆ خۆیان دڵیان خاڵی بکەنەوە. پاش نانی شێو داوام لێکردن تا هەموو پێکەوە سەرێك لەماڵی مینا بدەین.

هەموو پێکەوە چووین و کەوتینە دەمەتەقێ. مینا بە سەیرانی وت:

ـ عەزیزم! دیار نیت؟ من هاتمە سەردانت. بەڵام وتیان چووە بۆ هەورامان. نەمزانی گەڕاویتەوە.

ـ مینا! دەزانی من لە چ عەزابێکدام؟ تۆ نابێ چاوەڕێی من بیت. نابی تەنیام بکەیت!

ـ ئازاری چی سەیران! تۆ لەگەڵ یەلدای. ئەوەیە کە نیگەرانت نیم.

ـ بەڵام ئازاری من گرانە. دەردەکەم بێدەرمانە! تەنانەت بە یەلدای بەسەزوانیش چارەسەر ناکرێت!

ـ تۆ دڵدارێکی دڵسۆزت هەیە کە جێگای هانا و هاوارتە. ئەی مەگەر کاوەت لەگەڵ نییە؟

کاوەش هاتە قسە و وتی:

ـ راست دەکەی مینا خانم! هەرکە لێی دوور دەکەومەوە زۆر، ئازار دەچێژێ!

ـ کەواتە ئەی بۆ کارێك نەکەین، کاوە! وەرن با حەفتەی داهاتوو زەماوەندەکەتان بخەینە ڕێ.

ـ زۆر باشە. منیش هەر بۆ ئەو کارە گەڕاومەتەوە.
میناش وتی: با سووکە ئاهەنگێکیان بۆ بگێڕین و دواتر بڕون بۆ سەفەری مانگە هەنگوینە.
کاوەش وتی: هەرجۆر بەدڵی سەیران بێت وادەکەین. با بزانین رای خۆی چییە؟
ـ جا ئازیزم! بۆ کەسێك کە مەرگی میوان بێت، مانگە هەنگوینە و ئاهەنگی زەماوەند فەرقیان چییە؟ من، بەمزوانە من دەمرم ئەمە میوانی گڵ! ئەوەندە درۆم لەگەڵ مەکەن. قسەی ئێوەو فایل(پەروەندە)کانی نەخۆشخانە وەك یەك نین!
ـ بەو قسەیەی سەیران، دووبارە دڵم کەوتە لەرزین! مینا، خۆی پێ‌رانەگیرا و بە بیانووی چایی هێنان رۆشتە دەرێ. کاوەش تەکی بەلای سەیرانەوە دا و دەستی خستە سەرشانی و وتی: سەیران! مەرگ و ژیان لای خودایە....
ـ گوێ بگرە کاوە! چاوەڕوانی ئەوەت لێناکەم کە ئەگەر مردم ، دوای من ژن نەهێنی! داوام ئەوەیە، تەنیا چەند مانگ پاش مەرگم ژن بخوازی. نابێ بۆ من ژیانی خۆت بسووتێنی.
کاوە بە تووڕەییەوە وتی: واز بێنە سەیران! من پاش تۆ تەنانەت بۆ چەند کاتێکیش ژیانم ناوێ! یەلدا! تۆ شاهید بە، کەبەڵێنم داوە دوای سەیران مەرگ هەڵبژێرم.
زیاتر لە کڵپەی ئەشقی کاوە بۆ سەیران دڵنیا بووم. بگرە تا ئێستا شتی ئاوام نەبیستبێ. ئەو شەوە لە ماڵی مینا ماینەوە. ئێمە چووینە ژوورێك تا کاوە و سەیران بتوانن قسەی خۆیان بکەن. بەیانییەکەی بڕیار بوو لە دەرەوە میوانی کاوە بین. بەڵام سەیران نەیهێشت و وتی دەبێ بە دەستی خۆم ئەو داوەتە رێك بخەم.
پاش نانخواردن، بڕیارمان دا هەموو پێکەوە بچین بۆ زرێبار. بۆ لێواری دەریاچە جوانەکەی مەریوان. لەوێ وێنە و فیلمی زۆرمان هەڵگرت. سەیران، کراسێکی ئاورێشمینی مۆری لەبەر کردبوو. ئەو کراسەی کە کاوە بۆی هێنابوو.سەرپۆشێکی پوولەکچنیشی بەسەردا دابوو. ئەوەندەیتر جوان دیار بوو. تازە ئارایشیشی نەکردبوو! بگرە دەیزانی کە پێویستی بە ماکیاژ نییە. هەرچەند زۆر ئارام نەبوو. ئازارەکەی زۆری بۆ هێنابوو. هەرچیمان ئەکرد،بزەیەك نەئەکەوتە سەر لێوانی. ئەو رۆژە سەیران زۆر مەلوول و دڵتەنگ بوو. بۆیە زووتر گەڕاینەوە ماڵ. سەعات سێی نیوە شەو، سەرئێشەکەی زۆری بۆ هێنایەوە. ئەوەندەی نەبرد لەسەرخۆی چوو. کاوە لە ماڵی مینا بوو. تەلەفۆنم بۆ کرد تا خێرا بگەڕێتەوە. ئەویش بە پەلە گەییشت. دیتنی وەزعەکە زۆر ناڕەحەتی کرد و بە دەنگی بەرز بانگی لێکرد. بەڵام وەڵامێك نەبوو.

هەرجۆر بوو گەیاندمانە نەخۆشخانە. بردیانە ئورژانس(فریاکەوتن). دوکتورەکان لەسەری کۆ بوونەوە. ئەوان منیان دەناسی و لە هیچ درێغیان نەدەکرد. لەوێ خەواندیان. وتیان دۆخی سلامەتی باش نییە.

دوکتورەکە، من و کاوەی بردە ژوورەکەی و وتی: دەمەوێ شتێکتان پێ بێژم.

-چی بێژی دوکتور؟

- بە داخەوە،هاوسەرەکەت ئیتر ناژیی! مەیبەنەوە ماڵ. با لێرە بخەوێت. لەوانەیە لە پڕێکدا شتی ناخۆش روو بدات.

- جەنابی دوکتور! نابێ ئیجازە بدەن بچینەوە ماڵ و ئاهەنگێکی چکۆلانەی زەماوەند بگرین وئەوسا بگەڕێینەوە نەخۆشخانە؟

- نەخێر! ئەوە نابێ! ژنەکەت دەمرێ؟

کاوە پێی داگرتەوە. ئاخری دوکتور رازی بوو. بەڵام بەو مەرجەی دەرمانەکانی لەکاتی خۆیدا پێبدەین و دوای چەند رۆژ بیبەین بۆ کرماشان و لەوێ لە نەخۆشخانەی تایبەتدا بیخەوێنین.

سوپاسمان کرد.

کاوە، دەگریا و سەری دەکوتا بە دیوارەکاندا. هەرچی دڵداریم دەدایەوە، سوودی نەبوو.

- تکایە کاوە! دان بەخۆتدا بگرە. بە بۆنەی سەیرانیشەوە بووە، دەبێ هێور بی.خودا گەورەیە. بەرەحمە. لانی کەم ئەم چەندە رۆژە بە هێوری لەگەڵی بە. با ئاهەنگێکی باشی بۆ بگرین!

- تێدەگەم یەلدا! بەڵام گڕکانێك لە دڵمدا کڵپەی دێت و خەریکە دەمسووتێنێ. دڵم قورس بووە. خۆم پێ راناگیرێ. ناتوانم باوەڕ بکەم کە سەیران خەریکە بۆ هەمیشە بە تەنیام دێلێ. ئەو، هەموو ژیانی منە. بێقەرارم یەلدا! ئاخ ! کە ناتوانم کارێکی بۆ بکەم. تەنیا ناچارم بینەری هەڵوەرینی بم.

- نا. وەهاش نییە. تۆ سێبەری بەسەرسەرییەوە. نابێ ئاوەها ورەت ببەزێ. دەبێ خۆڕاگر بیت و تا دوایین کات هەوڵ بدەیت. خێرا بکە با جارێ بیبەینە کرماشان.

دەنگی ناڵەوهاواری وەڕسی دەکرد م. خۆمم هەرگیز ئاوەها بێتاقەت نەدیبوو. بگرە هی ماندووبوون بووبێت. هەرجۆر بوو چووینە ژوورێ. سەیران بەسەر تەختەکەوە کەوتبوو. سورۆمێك(ئاوێك) بە دەسیەوە کرابوو. ئارام هەناسەی ئەدا. دەستە ناسکەکانی کەوتبوونە ئەم

لاوئەولای و قژەخاوەکانی ئاوێزانی سەر روومەتی، پرژ و بڵاو ببوون. لێوە جوانەکانی وشک هەڵگەڕابوون. کاوە لە ژوور سەری دانیشت و دەستێکی هێنا بە قژەکانیدا و ئارام کلپەی گریانی هەڵدا.

بە هێواشی بانگم کرد: سەیران! سەیرانی ئازیز! بۆ تاوێك چاوەکانی هەڵهێنا و خێرا لێکی نانەوە. وادیار بوو لە هەموو شتێك وەڕی ببوو. گەرەکم بوو دووبارە بانگی بکەمەوە کە هاواری مینا رایچڵەکاندم. ئەو بە قیژە و هاوار، لەگەڵ شوەکەی کردیان بە ژووردا.

ـ ئەوە چی بوە یەلدا! توخوا چی بەسەر سەیران هاتوە؟ چۆن من نەمزانیوە! ئەی رۆ! سوەیلا پێی وتم چی بووە! دەك عومرم نەمێنێ!

شوەکەشی وتی: زۆربەداخم کاکە کاوە! چیمان پێدەکری؟ چیتان پێوستە لە خزمەت دام.

ـ هیچ ناکرێ. دەبێ سەبر بکەم تا بێتەوە سەرخۆ. خێرا دەبێ بیگەیەنمە کرماشان. گەرەکمان بوو بیبەین، بەڵام هەموو شتێك گۆڕا.

میناش بەدەم گریانەوە، خەریك بوو دڵداری کاوەی دەدایەوە.

زۆری نەبرد سەیران چاوی کردەوە. بۆمی روانی. بزەیەکی جوانی کرد و پرسی: یەلدا! من لە کوێم! چی بووە؟ کاوە کوا؟

ـ ئەوەتا عەزیزم! کاوە لای تۆیە. سەرت هاتبوە ئێش، بۆیە هیناومانی بۆ نەخۆشخانە.

کاوە هاتەپێش و وتی: ئازیزەکەم سەیران! تۆ باشتری؟

ـ تۆزیك سەرم لە گێژەوە دێ.

ـ باش دەبی. شتێك نییە.

ـ ئەی مینا؟ لە کوێیە؟

ـ ئەویش لێرەیە.

ـ عەزیزم بمرم بۆت! نەمزانی بوو ئێوارە حاڵت تێك چووە!

هەموومان دەورمان دابوو. سەیران، بە ئارامێك هەستایەوە و تی: شتێکم نییە. باشترە بمبەنەوە بۆ ماڵەوە.

لەم کاتەدا پەرستارەکە هاتە ژوورێ و وتی:

ـ خانمە باشەکە! هاتیتەوە سەرخۆت؟ باشتری؟ خۆت زویر مەکە. بڕوانە ! کێ وەك تۆ خانم دوکتۆرێك پەرستاری لێدەکات؟سەیرکە دۆستی چەندە باشت هەیە. لە دوێشەوەوە بە تەنیایان نەهێشتووی.

سەیران بە زۆر بزەیەکی ساردی کرد و وتی: کاتێ چاوم کردەوە، دایکم لام بوو. بەڵام ئێستا نەماوە. نە دەستی پڕ لەنەوازشی ئەو بەسەرما دێ، نە هی باوك، نە هی خوشك، نە هی برا! تەنانەت خوشکێکیشم نییە کەبۆم بگریت!باشە لەم دونیایە بێجگە لە مینا و یەلدا و هاوسەری ئازیزم کاوە، کێ شك دەبەم؟ ئەمانە گەنجینەکانی ژیانی منن.

ئەو قسە جوانانەی سەیران، ئەوەندەیتر دڵگرانیان کردم. وتم: تۆ هەر ئەو گەنجینەیەت نییە؟ لە هەرقسەیەکیشت گەوهەرێك دەبارێ!

ئەو شەوە، بە گوڵ و شیرینییەوە گەڕاینەوە ماڵ و بۆ بەیانییەکەی، لەگەڵ کاوەدا سەیرانمان برد بۆ کرماشان. کاوە مانتۆ و شڵوارێکی سپی بۆ هێنابوو. بەڵام مەخابن، گوڵە جوانەکەی ئێمە لە هەڵوەریندا بوو.

لە نەخۆشخانەی کرماشان، دوکتۆری پسپۆڕ هاتە سەری و پاش بینینی وێنە و پشکنینەکانی، وتی: سەیرە! خانمەکە، تۆ بەم هەموو جوانییەوە چۆن دووچاری ئەو نەخۆشییە بووی؟ دواتر بۆ خۆشی جوان پشکنیی برێ پشکنینیتری بۆ نواند. پێویست بوو دوو ڕۆژ سەبر بکەین تا وەڵامی ئەو پشکنینانە ئامادە ببێ. ئەوە بوو کەچووینە ماڵی باوکی کاوە. بنەماڵەیەکی باش و بەڕێز بوون. بە بینینی بووکەکەیان، هەرچیان لەدەس دەهات درێغیان نەدەکرد. زۆر بە دەممانەوە بوون و لێمانیان دەپرسیەوە. بە تایبەت شیوا خانم کە نازانن چی کرد!

کاوەش هەر پەرۆشی سلامەتی خۆشەویستەکەی بوو. سەیرانیش پەرۆشی ئەوە بوو کە کاوە بۆچی نارِوا بەلای کارەکانییەوە. تا ئەوەی بێدەنگیەکەی شکاند و بە منی وت: یەلدا! چی بووە؟ بۆچی کاوە ئەوەندە کپ و مەلوولە؟ هەرچی سەرنج دەدەم زۆر داتەپیوە، خواردنیشی کەم بوەتەوە؟!

ـ شتێکی ئەوتۆ نییە!

ـ ئەی باشە بۆچی ناگەڕێنەوە؟

ـ جارێ خۆ تازە هاتووین.

ـ یەلدا گیان! توخوا لێم مەشارنەوە. دوکتور چی پێ وتوون؟

ـ وابزانم بۆ گێڕانی ئاهەنگی زەماوەندەکە بە پەرۆشی! وانییە شەیتان؟

ـ واز بێنە یەلدا! توش ئەرکەکانت بە جێ هێشتوە!

ـ نا وا نییە. من ئیجازەم وەرگرتوە.

ـ ئەی کاوە چی؟

ـ ئەویش هەروا. ئەو مانگێك ئیجازەی وەرگرتوە. وازبێنە با لێرە بین، ئەها ماڵە خەزوورانت چەندە نەجیب و باشن!

ـ مەبەستم ئەوە نییە، یەلدا! نازانم بۆچی دڵم داتەپیوە؟

ـ نیگەران مەبە. پێت چۆنە برۆینە دەرەوە و کەمێك گەشت بکەین؟

ـ تاقەتم نییە.

ـ ئەی لەگەڵ کاوە؟

ـ حەز ئەکەم پشوویەك بدەم.

ـ چییە ! دەڵێی ماندووی؟

ـ وایە. ماندووم. خۆ کارێکیشم نەکردوە،بەڵام هەست بەماندوویەتی دەکەم! دەڵێی قژم دەکێشن!

ـ حەتم هی ئەو سەرئێشەیە، باشترە کەمێك ئیسراحەت بکەیت.

ئیتر نەمدەتوانی خۆم رابگرم. ئازیزترین دۆستم خەریك بوو لەدەس ئەچوو، ئەمەش بۆ من کوشندە بوو. چۆن دەمتوانی لەگەڵ ئەو کارەساتەدا رابێم. بەڕاستی زۆر دژوار بوو.

لەمکاتەدا کاوە هات و سلاوی کرد. لە ئەحوالڵمانی پرسی. وتم:

ـ زۆر نیگەرانم. دەڵێی چی بکەین؟

ـ منیش نازانم! باشە سەیران لە کوێیە؟

ـ سەری چڵ دەدا. چوو پشوویەك بدات. دەڵێ دەبێ بگەڕینەوە بۆ مەریوان.

ـ لەبەرچی؟

ـ نازانم.دەڵێی تێگەیوە.

ـ نا. نابێ سەبارەت بە نەخۆشییەکەی شتێکی پێ بێژین. ئەمرۆ سەعات دوو، من و تۆ پێکەوە دەچین بۆ وەرگرتنەوەی وەڵامی پشکنینەکانی. مەهێڵن سەیران بەمانە بزانێ.

ـ سەعات دوو چووین. ئاکامی پشکنینەکان و راوێژی پزیشکەکەی دەوێ، بەدیاریان خست کە پزیشکە پسپۆڕەکە ناهەقی نەوتوە. سەیران لە بارودۆخێکی خراپدا بوو. هەردەم لەوانە بوو تێكبچێت و تەواو بکات.

پزیشکەکە پێـی وتـین: زۆر بـەداخم! تەنانـەت ئەگـەر ببیەنـە دەرەوەی وەڵاتـیش، تـازە سوودێکی نابێ! کەس کارێکی پـێ هەڵناسـووڕێ. نەخۆشـییەکەی تەشـەنەی کـردوە. تـەنیا هیواتان بە خودا بێت.

کاوە وسکتی لێ بڕا و ژووری دوکتۆرەکەی بە جێ هێشت. ئەو زیاتر لە سـەیران پەرۆشـاو بوو.

پاش چەند رۆژ کە میوانی ماڵی باوکی کـاوە بـووین، بـە پێـداگری سـەیران، گەڕاینـەوە مـەریوان. کـاوەش بڕیـاری دا بڕواتـە هـەورامان و لـە بـاوکی سـەیران ئیجـازە بگـرێ تـا زەماوەندەکەیان بەڕێوە ببەن. ئەو بڕیـاری دابـوو هەرچـۆنێك بێـت ئـەو زەماوەنـدە بگێـڕن. نەیدەویست ئەو ئاواتەی سەیران بڕواتە ژێرخاك. ئەو بڕیاری خۆی دابوو. نەیدەویسـت سـەیران بەو ئاواتەوە بەجێی بێڵێت. ئەوە بوو بەرەو هەورامان کەوتە رێ و بۆ بەیانییەکەی گەڕایـەوە. داوای لە من و مینا کرد تا کارتی داوەتەکان ئامادە بکەین. خۆشی گەڕایەوە بۆ کرماشان تا بنەماڵەکەی ئاگادار بکاتەوە.

یەکەم رۆژی مانگی گوڵان بوو کـە ئاهـەنگێکی گـەورەمان لـە تـالاری گـەورەی شـاری مەریواندا خستە رێ. بنەماڵەی کاوەش، هەرهەموویان لە کرماشانەوە هاتبوون. سـەیران لـە سالۆن بوو. بە کامێرای فیلمگرتنەوە، بۆ هێنانی بووك، بەرەوە ئارایشگا لەگەڵ کاوە چـووین. سەیران لە جلوبەرگی بووکێنیدا، وەك خەرمانەی هەتاو پرشنگی دەدایەوە. تارایەکی تـۆڕینی سپی بەسـەردا درابـوو کـە تاجێـك لـە گـوڵی سـوور و زەرد و سـەوزی پێـوە بـوو. کراسـە پوولـەكچـنەکەی هـەفتا رەنگـی دەنوانـد.جووتێ پـێڵاوی پاشـنەبەرزی لـە پـێ بـوو کـە هەنگاوەکانیان وەك هەنگاوی فریشتە کردبوو. کاوەش بە جۆخەوڕانکەوە سەد ئەوەندەیتر جوان و پێکەوتوو بوو. بە دەستێکی دەستی بووکی گرتبوو و باقەیەك گوڵی جوانیش بە دەسـتەکەی تریەوە بوون. خەڵکانێکی زۆر لەبەردەمیاندا سـەمایان دەکـرد و سەرچـۆپی‌یـان رادەوەشـاند. بەوجۆرە من و سەیران و کاوە، سواری ماشینێك بووین کە بە گوڵ رازێنرابوویـەوە. قـەتارێك ئۆتومبیل(ماشین)، بە چەپڵەوگۆرانییەوە کەوتنە دوامان و بەرەو تالارەکە کەوتینەرێ. هەموو میوانەکان بە جوانی سەیران سەرسام بوون. جوانی و رازاوەیی بووك و زاوا، ئاهەنگەکەی چەند هێندە جوانتر کردبوو. میوانەکان وەسەما کەتبوون و چـەند ریـز دەسـتیان گرتبـوو. بـووك و زاواش بە سەر دوو کرسی تایبەتەوە، لە شوێنی خۆیان دانیشتن. بە تایبەت سەیران لە هەموو کاتێك جوانتر بوو. پێموایە هیچ پێویستی بە ئارایش نەبوو. جوانییەکانی ئەو سروشتی بوون و

چاوی هەرکەسێکیان ئەبرد. کاوەش جاروبار شاد و جاروباریش دائەتەما. خۆشحاڵ بوو کە بە ئاواتی چەند ساڵەی گەیشتبوو. خەفەتباریش بوو بەوەی کە خودا ئەو فریشتەیەی لێ بسێنێتەوە. سەیرانیش خەفەتبار بوو بەوەی کە دایکی نەمابوو و باوکیشی نەیئەتوانی لە زەماوەندەکەیدا بەشداری بکەن و هەروەها خۆشی نەخۆش و پەککەوتە بوو، بێجگە لەوانەش ئەو شتێکی نەبوو تا وەك جیهاز بۆ ماڵە شووی ببات. هەرچەند وێڕای هەموو ئەوانەش هەستی دەکرد بوونی لە سێبەری کاوەدا، هەموو دونیا ئەهێنێ. شیوا خانمی دایکی کاوە، بە بوونی وەها بووکێك، هەستی بە شانازی و شاگەشکە دەکرد. باوکی کاوەش، کە لە خانەدانێکی ناسراو بوو، هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد. مینا و شوەکەشی لەوپەڕی شادی و کەیفدا بوون. منیش کە لەسەر کورسییەکە دانیشتبووم، هەستم بەوپەڕی خۆشحاڵی دەکرد و لە خۆشیاندا خەریك بوو دەفڕیم. هەستم دەکرد چاوی سەیران دایم بە شوێن منەوەن و بۆ تاوێکیش هەڵسوکەوتەکانم نابوێرن. بە روانینەکانیا تێگەییشتم کە داوا دەکات بڕۆمە لای. میوانەکانم بەلاوەدا و خۆم گەیاندە لای و سەر و روومەتیەم ماچباران کرد. لێوەکانی دەتگوت خونچەن. بەگوشینی دەستە نەشمیل و ناسکەکانی، هەستم بە دونیایەك عەشق و خۆشەویستی کرد. دەستم کردە ملی و چەسپاندم بە سینمەوە. کاوە، بەردەوام چاوی لێ هەڵنەدەگرتین. شەوقی ئەشقم لە چاوەکانیا دەخوێندەوە. ئەو ئاهەنگە قورس و جوانەم پێ شادباش وتن و بە ئارامی بە جێم هێشتن. میوانەکان، بە تایبەت کەس و کاری کاوە، بەردەوام بانگی بووکیان دەکرد بێتە هەڵپەڕین. دەنگی هاواری ئەوان لە هۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. ئەوە بوو کە بووك و زاوایان کێشایە نێو دەستەی هەڵپەڕکێوە. ئەوانیش لە نێو ئاپۆرەی میوانەکاندا دەستیان گرت و کەوتنە هەڵپەڕکێ. چەندە جوان هەڵئەپەڕی سەیران! ئەتوت فریشتەیە. هەموان هاواریان دەکرد: ماشەڵڵا لە بووکێ! منیش بە کەیف و سۆزێکی تایبەتەوە چەپڵەم لێدەدا و هاوارم دەکرد. بەڵام لەدڵەوە دەمگوت: جوان و ئارام هەڵپەڕە، چونکە زۆرت نەماوە، خەریکی بەجێمان دێڵی.. مەگەر بڕیار نەبوو هەموو تاڵە و کەیفێکم لەگەڵ دابەش بکەیت؟ ئەدی بۆچی ئێستا ئەو داخە گرانە ئەنیت بەدڵمدا؟ لانی کەم دەتوانم لە پاڵت بم و ببمە شەریکی ئازارەکانت. هەڵپەڕە دەی هەڵپەڕە، ئەوەتا چارەنووس خەریکە هەڵت ئەوەرێنێ! کێ ئەڵێ تا چەندیتر ئەتوانی لەگەڵمان بیت، رەنگە هەر ئێستاس باروبنەت پێچابێتەوە و خۆت بۆ سەفەرێکی دوور و درێژ ئامادە کردبێت! هەڵپەڕە دەی هەڵپەڕە.. تا بارانی شادی بە سەر کوڵمەکانتدا ببارێت و لە لایەن میوانەکانەوە گوڵباران بکرێیت. واز بێنە با چاوەکانت دوا

نازەکانیان بنوێنن! واز بێنە با بۆ تاوێکیش بووبێت ئەو هەموو ئێش و ئازارەی رابردووت فەرامۆش بکەیت، واز بێنە، بەڵکوو دایکە کلۆڵ و غەریبەکەت لە قووڵایی قەبرە تەنگ و تاریکەکەیەوە ئاگاداری ئەو ئاهەنگە جوانەت بێت. واز بێنە بەڵکوو هەورەکان لە کوێستانەوە بێن و بەناڵەناڵ، بەسەر تالارەکەدا بارانی شادی دابکەن. با کوێستان پێبکەنێت و گوڵە کێویەکان بە باڵای ئاهەنگەکەتدا هەڵبڵێن. بەڵکوو «کۆسەی هەجیج» بەدوعای خەیر خواحافیزیت لێ بکات و گۆلی زرێباریش دەنگی شادیەکانت ببیستێ و مەبارەکیت پێ بێژێت. بەشکەم کانیاو و چۆمەکانی هەورامان هاوار بکەن: ئەی فریشتەی جوانی! زەماوەند و ئاهەنگی شادیت هەزارجار پیرۆز! واز بێنە با بە تەنیا من بانگی شیوەن هەڵبدەم. با پێبکەنم من! چۆن ئەتوان فەرامۆشت بکەم سەیران! باوەڕ بکە شکاتی خۆم دەگەیێنمە لای پەروەدگار کە بۆچی چارەنووسی ئێمە ئاوەها هەڵگەڕا. واز بێنە با باوکە پیر و نەخۆشەکەت، لەو خانوە خاکیەیەدا کە سەدان فرسەنگ لە تۆوە دووره بگریت. واز بێنە با بیرەوەرییە تاڵەکانی رابردوو، لەم تالارەوە بە جێت بێڵن.چووزانم ئێستا لەو دڵە ناسکۆڵەیەتدا چە غەوغایەکە؟ کە هاتمەوە سەرخۆ، بینیم چاوەکانم بوونەتە کانیاوی فرمێسك، دەستەکانم سارد بوونەتەوە، زەماوەندەکە بەرەو کۆتاییە. بە پەلە کەوتمە خۆ و خۆم گەیاندەوە لایان. بە کاروانێك پڕ لە شادیەوە، بووك و زاوامان تا بەردەرگاکەیان بەرێ کرد. گەرەکمان بوو لەگەڵیان دەورێکی زرێبارلێ بدەین. پێبدەینەوە، بەڵام سەیران نەیویست. وتمان بۆ بەیانییەکەی بەرەو مازندەران بڕۆن و لەوێ مانگە هەنگوینەی خۆیان بگوزەرێنن.

لە ماڵ، میوانەکان یەك لەدوای یەك خواحافیزیان کرد و چوون. سەیران هەستی بە ماندوویەتی زۆر دەکرد،بۆیە داوای کرد بڕوات پشوویەك بدات.

کاوە پەرێشان و بێئۆقرە بوو. منیش غەوغایەك لە دەروونمدا هەڵی کردبوو.

کاوە، بانگی کردم وتی: یەلدا! سەیران هێشتا هەڵنەساوە! نازانم بۆچی؟ بچۆ خەبەری بکەوە. باشترە تۆ بڕۆی با دڵی دانەخورپێ!

نازانم بۆچی ئەژنۆم هەڵنەدەستا بڕۆم. وەك هەردوو زەنگۆڵم تەزی بن. هەرجۆر بوو دەرگای ژوورەکەم کردەوە. ئارام نووستبوو و تاراکەی دابوو بەسەر دەم و چاویدا. چاوەکانی لێك نابوو و هەردوو دەستی خستبوە سەر سینەی. لە پاڵ سەریا دانیشتم و بە ئەسپاییەك بانگم کرد:

ـ سەیران گیان! بووکە گوڵەکەم! هەستە درەنگە. کاوە ماتڵە تا بەرەو مازندەران بکەونە رێ. میوانەکانیش هاتوون بۆ خستنە رێت. هەستە دەی تەمەڵ! بەس ناز بکە! کێ ئەیسێنێ!

هەرچیم کرد دەنگی نەبوو. کە سەرنجم دا... تا گیانم تیابوو قیژاندم!! هەموان رژان بەسەرمدا. کاوە رای وەشاندم!: چییە یەلدا! چی قەوماوە! بۆچی ئاوەها دەقیژێنی؟

من سەرم خستبوە سەر سینەی سەیران ووتم: کاوە! سەیران بۆ هەمیشە چوو!

ـ چی؟! یانیٚ مردوە!!

هەر دوو دەستی کوتا بەسەریدا. خۆی بە دەرودیواردا دەکێشا. زەماوەندەکە بە شیوەن وەرگەڕا. میوانەکانیش هەر هەموویان دەگریان.

منیش هاوارم کرد: ئێستا بۆچی عەزیزم، با زەماوەندەکەت تەواو ببوایە!

باران ئەباری و شنەیەکی فێنك لە کێوەکانی هەورامانەوە ئەهات. مەرگی سەیران، لە شاردا دەنگی دایەوە و دەوری ماڵەکە بوو بە رۆمەڵخەزا! هەورەگرمە بۆ تاوێکیش نەدەوەستا و باران ونارەی نەدەدا. خۆشی نەدەگردەوە دەتگوت هەورەکانیش نیشتوونەتە شیوەن و بەسەر شاری مەریواندا فرمێسك ئەڕژێنن. سەیرانیش بە جلوبەرگی سپی بووکێنییەوە، ئارام نووستبوو. چیتر نەمدەتوانی خۆم بگرم. هەرگیز باوەڕم نەئەکرد ئیتر ناتوانیٚ هەستێتەوە. لە ژوورەکە دەرپەڕیم و پڕ بەدڵ بانگی گریانم هەڵدا. میناش خەریك بوو خۆی دەڕنییەوە دەگریا.

بڕیارمان دا لەسەر وەسیەتەکەی خۆی جەنازەکەی ببەینەوە هەورامان. بۆیە کاروانێك لەگەڵ جەنازەکەیدا بەرەو هەورامان بەڕیٚ کەوت تا لەبنپاڵی دایکیدا بینێژین.

نەمدەتوانی قەبووڵ بکەم کە سەیران لە بری چوون بۆ مانگە هەنگوینە، ئاوەها بخزێتە ژێر خاکەوە.

پاش بەخاك ئەسپاردنەکەی، باوکی سەیران و باوەژنەکەی و بنەماڵەی کاوە و مینا، هاتنە سەر مەزارەکەی. باوکە پیرەکەی بە کوڵ دەگریا و دەیلاواند:

ـ کچە جوانەکەم! چەندە تاڵیت چێشت! گوڵە سوورەکەم! بۆچی بە جەوانی پەڕپەڕ بووی؟ بۆچی بە تەنیات جیٚ هێشتم ئەویش بە باروسەربارێك خەمەوە؟ بۆچی کچم! بۆچی؟ بۆچی کاتەکانی ئاخری ژیانت لای من نەمایتەوە و لە پاڵمدا نەبووی؟ بۆچی دەرفەتی ئەوەت نەدا لانی کەم چەند تاوێك لە خۆشییەکانت ببینم؟ کچە نازدارەکەم! بۆچی وەها بێدەنگ کۆچت کرد؟ بۆچی ئاهەنگی زەماوەندەکەت کردە شیوەن؟ خۆشەویستم! راستە نەمتوانی باوکێکی باش بم، نەك هەر خۆشبەختم نەکردی، بەڵکوو بەدبەختیشم کردی! بوومە هۆی ئەو هەموو ستەمەی لێت کرا. تۆم فروشت! ئەمانە لەبەر ئەوە نەبوون کە خۆشم نەدەویستی! نا، بەڵکوو

نەمدەزانی دەبێ چۆن خۆشم بوێی و چیت بۆ بکەم. ئـای خوایـەگیان! خوزگـا بەرلـە مـەرگی سەیران گیانی منت ئەکێشا تا بە چاوەکانی خۆم بینەری ناشتنی نەبوومایە...

کاوەش لەو لاوە بە کێلی قەبرەکەیدا هەڵزنابوو و هەنسکی ئەدا. هەرچی بـاوك و دایکـی دڵخۆشییان دەدایەوە، ئارامی نەدەگرت. هەرچەند شیواخانمیش بۆخۆی هەر خەریکی شیوەن و سەروسینە کوتان بوو. میناش سەری خستبوە سەرشانی من و بەردەوام بۆ رابـردووی سـەیران دەینالاند.

وردە وردە ئەوانیش چوون. تەنیا من مامەوە و باوکی سەیران و شکۆفەی باوەژنی.

باوکی رووی کردە شکۆفە و وتی: دیت! تێگەییشتی؟ ئەزانی کە ئازیزەکەم بە جێی هێشتم و ئیتر کەسێك شك نابم! بێکەس و تەنیا و نەخۆش و پەککەوتـە! ئـافرەت چـەندەم پـێ وتـی ئەوەندە خراپەی دەرهەق مەکە! رۆژێك پەشیمان ئەبیتەوە؟ تازە ئەومان بـۆ ناگەڕێتـەوە، لـە دەسمان چوو! ئایەی رۆڵە بێنازەکەم ئای........

شکۆفەش دەگریا و سەروسینی خۆی دەکوتا. بەزەییم پێیاندا هاتەوە، چـوومە لای باوکـە پیرەکەی، دەستم گرت و بردم بەسەر بەردێکەوە دامنا.

ـ باوکەگیان! بۆچی ئاوەها لەخۆت دەکەیت؟ نسیبی ئـەوە بـوو. ئـەوە چارەنووسـە! ئـەو هەموو گریان و هاوارە تازە سودی نییە. بڕوا بکە منیش گەوهەرێکی نایابم لـە دەسـت داوە. بەڵام هێشتاش سوپاسی یەزدان دەکەم کە توانیم بیدۆزمەوە و لانی کەم بۆ ئەو ماوە کەمـەش لەگەڵی بم. ئـەو لـە بێدەنگیـدا ئازارەکـانی تەحـەمول دەکـرد و بـە بێـدەنگیش گیـانی بـە پەروەردگار بەخشی. ئەو لەژیانیدا قوربانییەك بوو. بێگوناح و بەرستەم بـوو. بەتایبـەت کـە بێدەنگییەکەی جوانییەکی تایبەتیی پێ دەبەخشی و بەرانبەری چەند هێنـدەی دی ئەوینـداری ئەو دەکرد. لە قوڵایی چاوەکانیدا ئەشق و خۆشەویستی هەرایان دەکرد. ئەرێ باوە گیـان! تـۆ دەبێ بەوەها کچێکەوە شانازی بکەیت. نابێ ئەوەندە مەنحولۆمەی شکۆفەش بکەیت، راسـتە ئەو لەگەڵ سەیراندا توندی کردوە، بەڵام دڵی پاکە.

حەوتەیەك لە مەرگی سـەیران گوزەرابـوو. مـن دوچـاری خـەمۆکی ببـووم. نەمـدەتوانی کارەکانم بە باشی بەڕێوە ببەم. چەندرۆژێك بوو کاوەشم نەدیبوو. تا ئەوەی رۆژێك لە شەقامدا بینیم. قژەکانی ئاڵۆز ببون و پشتیشی چـەما بوویـەوە. ئیـدی ئاسـەوارێك لـە قەدوقامـەتی جارانی بەدی نەدەکرا. دووجار بانگم کرد تا بیستی. بەرەولام هات. سڵاوم لێکرد. سەندیەوە.

وتم: دیار نیت؟

ـ ئەگەر ئێوەش لە جێگای مندا بوونایە، سەری خۆتان هەڵدەگرت.

ـ نازانم چی بڵێم، بەڵام لەگەڵ چارەنووسدا شەڕ ناکرێت.

ـ باشە یەلدا خانم! ئیدی دوای سەیران ژیانی من بە کەڵکی چی دێ؟ چۆن ئەتوانم بە دونیادا بگەرێم؟ دوای سەیران ژیانی منیش مانایەکی نەماوە.

ـ ئەوەندەش بێهیوا مەبە! تازە ئەو لەدەس چووە، بەڵام بیرەوەرییەکانی لەگەڵمان ماون. ئەو هاوسەری تۆ بوە و هەڤاڵی من. کاتەکانی غەریبیم لەگەڵ ئەو بەسەر دەبرد. هەرگیز خراپەیەکم لێ نەدیوە. ئەو لە دڵماندا دەمێنێتەوە، بۆ هەمیشە.

خوڵکم کرد. پێموت کە دایك و باوك و سیروسی براشم بەڕێوەن بەرەو ئێرە دێن. وتی: جارێ کەمێ کارم هەیە. کاتت دەگرم.

تا من چوومەوە، دایك و باوك و براکەشم گەیپشتبوون. یەکتریمان ماچ کرد. فرمێسك لە چاوانی سیرووسدا قەتیش مابوو.

ئەوان بەردەوام دڵخۆشی منیان دەدایەوە و منیش سوپاسم دەکردن.

دایکم وتی: یەلدا! بۆت زۆر بەپەرۆشم. مەرگی سەیران هەموومانی ئازار دا. ئێمەش بە هاوخەمی خۆت بزانە کچم! چیمان پێ دەکرێ، مەرگ هەر دێ، ئەوە راستییەکە. ئەبێ قەبووڵی بکەین.

باوکم و سەیرانیش دەسکەمێکیان لە دایکم نەبوو. بە تایبەت سیرووس کە بەردەوام باسی لە هەستەکانی خۆی سەبارەت بە سەیران دەکرد.

پاش کەمێك کاوەش هات. سەرەخۆشی یان لەویش کرد و بڕیارمان دا پێکەوە بڕۆین بۆ زیارەتی مەزاری سەیران.

سیرووس کە ئۆتۆمبیل(ماشین)ەکەی لێدەخوڕی، ئەوەندە پەلەی بوو کە بایەخی بە ناخۆشی جادەکە نەدەدا. هەرکە بە پێچەکاندا تێپەڕ دەبووین، بیرەوەرییەکانی سەیرانم لا زیندوو ئەبوونەوە. بە تایبەت ئەو کاتەی کە بەم پێچانەدا لەگەڵ سەیوان دەهاتین تا بۆ تەڵاقی ئەوان بچینە دادگا....

بەسەر مەزاری سەیرانەوە شیوەنمان گەرم کرد. بە تایبەت دایکم بانگی هەڵدا. سورەتی فاتیحای خوێند. باوکیشم بەردەوام بۆ ئاسوودەیی روحی نزای دەکرد.

نەمزانی کاوە، چۆن ئەوەندە خێرا توانیویە ئەو کێلەمەڕمەڕانەی بەسەرەوە دابنێ کە شیعرێکی خۆی لەسەر هەڵك نرابوو.

بەخوێندنەوەی شیعرەکە، خۆم پێنەگیرا و بانگی شیوەنم هەڵدا. قورگم هاتبووه یەك. خەریك بوو دەخنکام. دایکم هات بە دەممەوە و هێوری کردمەوە. کاوەش هەروا.

دەمەو ئێوارە، ماڵاواییمان لەسەیران کرد و بە دڵێکی مەلوولەوە بەرەو مەریوان گەڕاینەوە. بۆ بەیانییەکەی باوك و دایکم بەرەو تاران گەڕانەوە و کاوەش دیار نەما. من بە تەنیا مابوومەوە. لە تەنیاییدا هەرچی زیاتر بیری سەیرانم دەکردەوە وزیاترخەمیم دەبوو. خەووخۆراکم نەمابوو. بەهەموو کون و قوژبنێکی ماڵەکەوە سەیرانم ئەبینی و شێوەی ئەهاتە بەرچاوم. زۆرجار نەمدەتوانی بڕۆمە سەرکارەکەم. ئێوارەیەك بڕیارم دا بچمە لای مینا تا بەشکەم کەمێك بێمە سەرخۆم و لە تەنیایی رزگارم بێت. لە هەیوانەکەیاندا کەوتبووینە دەمەتەقێ. باسی بیرەوەرییەکانی سەیران، سەرلێ شێواویەکەی کاوە! مامەفەرەج!...

لە ناو باسەکاندا، هەستم کرد کە مینا خەریکە بەرەو مەبەستێك هانم دەدات. ئەویش کشانم بەرەو کاوە بوو بۆ ئەوەی بتوانم لەو قەیرانە روحیە رزگاری بکەم؟! دووبارە وەسوەسەکانی سوەیلام بیر کەوتەوە و چوومە ناخی بیرەوەرییەکانی سەیران!

بەڵام من و مینا هەستمان بەوە کرد کە چەند رۆژێکە کاوە دیار نییە؟ تۆ بڵێی بێ خواحافیزی گەڕابێتەوە! ئەوە بوو تەلەفۆنمان بۆ شیواخانمی دایکی کرد. کەچی ئەویش هیچ خەبەرێکی نەبوو. چەند رۆژ گەڕاین، بەڵام نەمانتوانی بیدۆزینەوە. تا ئەوەی بڕیارمان دا لە هەورامان سۆراخی بکەین. تەلەفۆنم بۆ دۆستێکم کرد. وتی: دووسێ رۆژ پێش ئێستا بەسەر مەزاری سەیرانەوە دیویەتی. بۆیە لەگەڵ مینا و مێردەکەیدا بەرەو هەورامان کەوتینە رێ. بە گەردەنەی ژاڵانەوە ناسراوێکم دی. دووبارە سۆراخی کاوەم گرت. گوتی: چەند رۆژ پێش لە ماڵی مام فەرەج دیویەتی. ئیتر تا هەورامان نەوەستاین و چووینە ماڵی مام فەرەج. بە بینینی ئێمە بانگی شیوەنی هەڵدا و کەوتە لاواندنی سەیران....

هەواڵی کاوەم پرسی. شکۆفە وتی: چەند رۆژێکە لێرەیە. دوێنێ نامەیەکی پێدام تا بیگەیەنمە دەستی تۆ. ئەودامـاوە ئارام و ئۆقرەی نەماوە. رۆژتا ئێوارە بەم هەردانەوەیە!

نامەکەم خوێندەوە. وتبووی بە سەر مەزاری سەیرانەوە نامەکەی نووسیوە. باسی بیرەوەرییەکان و قووڵی ئەشقی خۆی سەبارەت بە سەیران و ئەو دۆستایەتیەی کردبوو کە من و سەیران پێکەوە هەمانبووە. ....ئازای گیانم نیشتە لەرز. رەنگم هەڵبزرکا. زمانم گیرا...

بەپەلە هەستاین. خەڵکمان ئاگادار کرد. بە لووتکەی یاڵەکانی هەورامانەوە شوێنێك هەبوو کە سەیران زۆر خۆشی دەویست. پێیان دەگوت : باباحەیرانێ. سەیران ئاشقی ئەوێ بوو.

من و کاوە بەوەمان دەزانی. باوکیشی هەروا. ئەویَ کویَستان و سارد بوو و هیَشتا بەفری خاڵخاڵ نەبووبوو. چەند رۆژی برد تا لاشەکەیان لەویَ دۆزیەوە. یەخی بەستبوو. ئازای گیانی تەڕوتلیَس بوو. دیار بوو بارانی ئەو چەند رۆژە و سەرمای شەوانی ئەو لووتکانە لە پیَیان خستبوو.

جەنازەکەی کاوەش بە بەشداری هەموو خەڵکی هەورامان، شان بە شانی گۆڕەکەی سەیران نیَژرا.

پاش چەند هەفتە، ئەرکەکانی منیش لە مەریوان کۆتاییان هات و باروبنەم پیَچایەوە و بەرەو تاران گەڕامەوە. بەڵام بە دونیایەك بیرەوەری و جوانی و پرسیارەوە.